# شیعر و هەڵوێست

دیوانی

شەهید مەلا عەلی

و

چەپکێک بەڵگە و بیرەوەری

# شیعر و هەڵوێست

## دیوانی شەهید مەلا عەلی
## و
## چەپکێک بەڵگە و بیرەوەری

ئامادەکردنی

**ناوەندی ئەرشیفی مەکتەبی سیاسی**

**یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان**

2011

له بڵاوكراوەكانی یەكێتی نوسەرانی كورد/ لقی سلێمانی

زنجیرە ( ٣ )

ناوی كتێب : شیعر و هەڵوێست (دیوانی شەهید مەلا عەلی)

بابەت : شیعر

بەرهەمی شاعیری شەهید حسێن مەولود (شەهید مەلا عەلی)

تایپ: ئاڤێستا عومەر

هەڵەبڕی: ئەمیرە محەمەد

دیزاینی بەرگ و ناوەوە : بازیان جەلال

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

چاپخانە : چاپخانەی حەمدی

سلێمانی ٢٠١١

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان

ژمارەی (1795)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە

ئەم دیوانە شیعریەی لەبەردەستدایە، بەرهەمی هەستی پەنگ خواردوی دەروونی شەهیدێکە، لە ماوەی چەند مانگێکی مانەوەیدا لە زیندانەکانی ڕژێمی فاشی بەغدا وەکو گوڵ پشکوتنی خێرا و شوێنەواری ڕەهێڵە و دڕکی ئازاردەریان پێوە دیارە. لەسەر پارچە سیم (وەرق) ی نێو پاکەتە جگەرە تۆماری کردوون و پاراستوونی هەتا ڕۆژانی دیدەنی کردنی و بە کەس و کاریدا ناردونیەوە ..

کە هەندێکیان ئارەق و چڵک و خوێنیش، کاری تێ کردوون گوڵ ئاسایی شەمزاندونی.

هەروەک خۆی پێی سپاردووین (ئەگەر دەرفەت ڕەخسا پێشکەش بە هاوڕێ یانی بکەن).

بەم جۆرە دیاری شەهیدێکتان ئەخەینە بەردەست

ئەحمەد مەولود ئەحمەد
پایزی ١٩٨١

# شەهید مەلا عەلی و
# خولیای لەگەڵ ئەدەب و نووسین

عبدالکریم مەولود (برای شەهید)

شەهید مەلا عەلی هەر لە سەرەتای ژیانیەوە خولیای ئەدەب و نووسین بووە، وە نەبێ تەنها لە بواری شیعردا ڕۆڵی بووبێت بگرە لە بوارەکانی دیکەی ئەدەبیدا وەک چیرۆک و پەخشان و وەرگێڕاندا دەستی هەبووە.

لە ژیانیدا هەرگیز نەبووە تەنها بەکارێکەوە خەریک بێت لەبەر ئەوەی لە لادێ ژیاوە، ڕۆژانە کە لەخوێندنگە هاتۆتەوە دوای نیوەڕۆیان خەریکی ئیش و کاری کشتوکاڵ بووە یان شوان بووە، بەڵام زیاتر حەزی بە شوانی دەکرد چونکە دەیتوانی لەو دەشت و کێوە ئازەڵیش بلەوەڕێنێ و خۆشی پەروەردە بکات بە خوێندنەوە، هەموو جار دەیگوت باشترین شوێن بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتن دەشت و دەرە، لە لایەک هەواکەی پاک و دڵگیرە و لە لایەکی ترەوە هیچ کەس خەریکت ناکات بە شتی لاوەکیەوە، بۆیە ئارەزووی کەمتر لە ئیشی کشتوکاڵ بوو، لەم بوارەدا مرۆڤ دەبێ هەردەم دەست و مێشکی خەریک بێ بە داس، خاکەناز، بێڵ و ...هتد

شەهید مەلا عەلی هەرچەندە لە ژیانیدا لە خێزانێکی جوتیار و هەژار بووە بەڵام لایەنە ئەدەبیەکەی فەرامۆش نەکردووە. ئەم نوسراوانەی هەبووە هەتا ئەو ڕۆژەی کە پەیوەندی کردووە بە حـ.ی.ک لە هەرێمی ای ئەوسای (ی.ن.ک) کە ۱۹۷۶/۵/۱۱ دەکات، کە ئەمە ناوی هەندێکیانە:

أ- کورتە چیرۆک : ۱. شانەی گەنم.... ۲. کۆچەری
۳. سێبەری سابات ٤. دارەبەن.

ب- دیوانی شیعری کلاسیکی ونوێ زیاتر لە ١٠٠ لاپەرە.

ج- وەرگێڕان: گۆڕینی کۆمەڵە چیرۆکی - الارواح المتمردە- جبران خلیل جبران بۆ کوردی.

٢) گۆڕینی پەڕاوێکی بڕیار لەسەر دراو بۆ خوێندنی کۆلێژی ئاداب بۆ کوردی.

٣- گۆڕینی هەندێ نامیلکەی ماو - یومیات جندی فیتنامی- هەندێ شیعری محمود دەروێش (سرودەکانی بەرگری فەڵەستینی) ...هتد

د- ئاخاوتنێک لەگەڵ چەند کادرێکی حیزبی دیموکراتی کوردستان - ئێران لە حەفتاکاندا لەگەڵ چەند بابەتی تر.

جگە لەمانە مزکراتی خۆی کە لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییەوە دەستی پێ کردبوو زۆر باس و لێکۆڵینەوەی بایەخداری تێدا تۆمار کردبوو، ڕووداوەکانی ساڵ بە ساڵ داتەڕشتنەوە بە گوێرەی پتر بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و هۆشیاری بە تایبەت لەسەر بزوتنەوەی چەکداری کورد لە دوای ساڵی ١٩٦٣ هەتا ئەو رۆژەی کە لەلایەن ڕژێمەوە بەدیل گیرا لە ڕۆژی ١٩٧٩/١/٣٠.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا کۆمەڵێک بابەتی ئەدەبی نوسیوە بە تایبەت لە ساڵی ١٩٧٧ کەلە سەرکردایەتی لە دەورەی کادران بووە.

هەموو ئەمانەی باسمان کردن لەگەڵ چەند ئەلبومێک وێنەی سەردەمی خوێندن و پێشمەرگایەتی بەردەستی ڕژێم کەوتوون و وەک خۆی شەهید بوون؛

١- لە ساڵی ١٩٧٧ کە ئاشکرا بوو لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە خۆی گەیاندە شاخ بەلام فریا نەکەوت شتەکانی دەرباز بکات بەشێکی شتەکانی لەبەشی ناوخۆیی خوێندکارانی زانکۆ کەوتە بەر دەست ئەمنی سلێمانی.

٢- هەر لەو ساڵەدا ڕژێم زۆر بەدوایدا گەڕا لە ئەنجامی ئەو گەڕانەدا کتێبخانەکەی لە ماڵی خۆمان لە گوندی (کۆکە) گیرا. ئێستاش زۆر لە هاوڕێکانی

کە ماون دەڵێن ماڵەکەی کتێبخانەی کۆمەڵە بوو.

٣- لە ساڵی ١٩٧٩ کە خۆی لە پێشمەرگایەتیدا کەوتە دەست ڕژێم هەندێ لە شتەکانی لە کۆڵە پشتەکەیدا بوون و گیران.

٤- چەند ڕۆژێک دوای گیرانی هەموو ئەو شتانەی کە مابوونەوە لە گوندەکەی خۆمان گیران. ئێستاش لە یادم ماوە ئەو هێزە سەربازییەی ڕژێم کە هات بۆ گوندەکەمان ئێمەیان گرتوو دووریان خستینەوە، گەلێک شتی تری ئەو کاتە لە ترساندا بەناشارەزایی شاردمانەوە و لەژێر گڵدا ڕزین.

ئەو وێنە و نوسراوانەی کە ئێستا ماون لای هاوڕێ و هاوسەنگەرانی کۆمان کردوونەتەوە. چەند وێنەیەکیان لە ساڵی ١٩٧٧ هەتا ساڵی ١٩٩١ کاتی ڕاپەڕینەکە لە ئەمنە سورەکە بوون دوایی کاک ئەوشیروان بۆی ناردینەوە کە کەوتبوونە دەست بەڕێزی.

ئەم چەند هۆنراوەیەی کە ئێستا بڵاو دەکرێنەوە جگە لە هۆنراوەی (لەگەڵ خولانەوەی چەرخی زەمانە) کە هی کاتی پێشمەرگایەتیە ماوە، ئەوانی دیکە لە ڕۆژانی بەندینخانە نووسیونی و ماونەتەوە لەسەر سیمی پاکەتە جگەرە.

هاوڕێیەکی زیندانی خۆی بۆی گێڕاینەوە کە ئەو ئازاد کرا وتی: کاتێک جەلادەکان هاتن کەلەپچەیان کردە دەستی و چاویان بەستەوە، داوای کرد وتی: دەستم بکەنەوە بۆ ئەوەی خۆم پەتەکە بخەمە ملی خۆم. بەڵام ڕێیان پێ نەدا. کاتێکیش پێیان وت وەسیەت بکە لە وەڵامدا وتی (القرار بیدکم والتاریخ لم یرحمکم)

# مەلا عەلی تێکۆشەرێکی دەگمەن

## مەلا بەختیار

مەلا عەلی: ناوێکە بە توانای سیاسی، شۆڕشگێڕی، قارەمانی و ئەدەبی خۆی، خۆی بە هەموو گەلەکەمان ناساندووە، بۆیە پێموایە من و کەسانی دیکە، پێویست بکات، ناسنامەی (مەلا عەلی) و ڕۆژمێری تێکۆشانی، باس بکەین.

من، لە خەباتی نهێنیدا، ناوی (مەلا عەلی)م بیستبوو، بە تایبەتی ئەو کاتەی ڕەوتێک لە کۆمەڵە، یان ڕاستتر وایە بڵێین: لە هەلومەرجی نائومێدی ڕاوەدونان و گرتن و ڕەشبینی کۆمەڵەدا، کە بەر هێرشی بەعس کەوت و زۆر بوون ئەوانەی لە کۆمەڵەدا پێیان وا بوو، جارێکی دیکە کۆمەڵە نابوژێتەوە، لەو هەل و مەرجەدا، بە تایبەتی ئەو کاتە لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا، مشتومڕی ئایدۆلۆژیش لەسەر ڕێبازی کۆمەڵە، لە هەناوی ڕێکخستنە کەم و پوختەکەیدا، زیاتر لە جاران لەسەر ناکۆکی سەرەکی گەلی کوردستان و ناکۆکی لاوەکی، کە ئایە بەعس ناکۆکی سەرەکییە، یان ئیمپریالیزمی ئەمریکی؟ ئەمەش زادەی تیزی سێ جیهانەکەی لەسەر ماوتسیتۆنگ و چینی ئەوسا بوو؛ لەم ناکۆکییە کە زۆرتر لە دوای ڕێکەوتن نامەی جەزائیر (پێش گرتنی هاوڕێیانی کۆمەڵەش) سەریهەڵدابوو، کە گرتن و ڕاوەدووونان، بە تایبەتی گرتنی شەهید ئەنوەر زۆراب لە (١٩٧٥/٩/٣) هەروەها هاوڕێیانی دیکەی کۆمەڵەش، ئیتر هەبوون لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵە، ململانێی و جیاوازییەکانیان، لەگەڵ دۆخی شڵەژاوی کۆمەڵە تێکەڵاو دەکرد و جارجارەش، ئابابەتی حوکمیان لەسەر دۆخەکە و سەرکردایەتی ئەوسای کۆمەڵە دەدا.

ئەوەی بە ناوی کۆمەڵەی رەنجبەرانەوە هەنگێنی سەریهەڵدا، بەشێکی زۆری پەیوەندی بەو دۆخەی کۆمەڵە و هەل و مەرجی سیاسی و رێبازی ئایدۆلۆژیەوە هەبوو.

شەهید مەلا عەلی، کادرێکی هەڵسوڕاوی ناو کۆمەڵەی رەنجبەران بوو، شەهید برایم خەلیل رابەرایەتی دەکرد. منیش، ئەو کاتە بە بڕیاری شەهید ئارام و لە رێگەی شەهید(شامیل- شوان عەلی) یەوە، راسپێردرام گفتوگۆ لەگەڵ شەهید «برایم خەلیل» دا بکەم، بەڵکو ئەو کێشەیەی کۆمەڵە چارەسەر بکەین. لە ماڵی «برایم حەسەن» لەگەڵیان دانیشتم، ئەو کاتە نەگەیشتینە ئەنجام، بڕیارماندا درێژە بە گفتوگۆ بدەین. ئاک ئاکیش پەیوەندیمان بەو هاوڕێیانەوە دەکرد، کە لەگەڵ ئەواندا کاریان دەکرد و دەشهاتنەوە ڕیزی کۆمەڵە.

کاتێک بڕیاری شۆڕش درا، ئیتر بۆ هەموو لایەک دەرکەوت کە (کۆمیتەی هەرێمەکان) سەبارەت بە ڕێبازی سیاسی کۆمەڵە، ئاگۆکی سەرەکی ساغکردۆتەوە و تێزی بێ پێزی سێ جیهانیشی فەرامۆش کردووە. ئەمە کاریگەری زۆری لەسەر هاوڕێ زویربوەکانی کۆمەڵەوە هەبوو بێنەوە ریز.

مەلا عەلی، یەکێک بوو لەو هاوڕێیانە. پاشان برایم خەلیلیش هاتە ریزی شۆڕش و شەهیدیش بوو، کۆمەڵەی رەنجبەرانیش نەما.

بە حوکمی ئەوەی مەلا عەلی خەڵکی دێی کۆکەی ناوچەی دوکان و بناری پیرەمەگرون بوو، ئەرکی هەڵسوڕانی سیاسی و رێکخراوەیی لەو ناوچەیەدا پێ سپێردرابوو، پەیوەندی بە رێکخستنەکانی شاریشەوە، هەندێک جار لەرێی منەوە، بۆ ئەو ناوچەیە دەکرا.

من، لە گەشتێکی (٧) مانگەی دەشتی هەولێر و رۆژهەڵاتی کۆیە و خۆشناوەتی دەگەڕامەوە بۆ قەراغ و سەردانی شەهید ئارام. (١٩٨٧/٣/٣) لە گوندی یاخسەمەر بووم، هاوڕێم دلێری سەید مەجید و شەهید غەریب هەڵەدنی،

بەیانیەکەی، لە مزگەوتدا، هەواڵی شەهیدکرانی ئارامی مامۆستا و هاوڕێیان پێدام. گوندی یاخسەمەر، دەکەوێتە بناری شاخی ئاسنگەران، لەسەر ئەو شاخە هەڵیان دابامە خوارەوە، هەر هێندەی هەواڵی شەهید ئارام کاریگەری ئەبوو لەسەرم، خۆم پێ نەگیرا، قوڵپی گریان دایگرتم، دەستبەجێش کەوتمە ڕێ بۆ قەراغ، هەتا لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی شەهید بونی کاکە ئارام بکەم، لە دۆڵەڕوت و لە نزیک گوندی هەناران، چاوم بە شەهید مەلا عەلی کەوت، ئیتر یادگارەکانی خەباتی نهێنی و جیاکردنەوەی ڕەنجدەران و کێشمەکێشەکانم بیر کەوتەوە، کە بینیم هاوڕێیەکی جوامێر، دڵسۆز، وشیار و لە خۆ بوردوو هاتە بەرچاوم. شەو و ڕۆژێک پێکەوە بوین، بوو بە هاوڕێیەکی ڕۆحی نزیکم، ئیتر لە بیروباوەڕ و جوامێری (مەلا عەلی)یەوە باشتر تێگەیشتم ئەو جۆرە جیابونەوەیە، لە کۆمەڵە، بناغەی نەبووە، بەڵکو بەرژەنی و وردەناکۆکی خوڵقاندبووی.

مەلا عەلی، بەرەو ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی کەوتەڕێ و هەتا بناری پیرەمەگرون بەڕێی کردین، ئێمەش بەرەو بۆ قەراغ و لێکۆڵینەوە.

دوای ئەوە، زۆری نەخایاند چارەنوسی مەلا عەلی گیران و زیندان بوو. سەرەنجام دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر و بەرگەگرتنێکی قارەمانانە، بڕیاری لە سێدارەدانی جێبەجێ کرا.

من، زۆرم لا مەبەستە، لەم نامەیەدا، شەهید (مەلا عەلی) لەڕێگەی شیعر و یادگارەکانیەوە، باس بکەم، نەک شتی تر.

مەلا عەلی، دێر بە دێری شیعرەکانی جگە لەوەی لەو کونجی زیندانەدا، سەلماندویەتی بەهرە هەر بەهرەیە، لە ناخۆشترین ڕۆژگاریشدا، بەهرەمەند دەتوانێ بەهرەکەی بپشکوێنێ، جگە لەمە، لە ڕووی هونەری شیعر و داهێنانەوە، دەڵێم: ئەو شیعرانە، بە شیعرە سیاسی و خۆشەویستیەکانیشەوە، هاواری عشقە بۆ کوردستان و پێشمەرگە و سەرکەوتن و کۆمەڵە.

وشە بە وشەی شیعرەکانی، هۆنینەوەیەکە، هەر دەڵێی (مەلا عەلی) فێرگەی خۆڕاگری لە زینداندا بۆ تێکۆشەران جێدێڵێ. ئێوە ببینن چۆن- سەردەکەوێتە سەر پەتی سێدارە و سەری جەلادەکان لە شیعردا لە ژێر پێڵاوەکەی خۆیدا دەبینێ؛ بۆڵەبۆڵی پێشمەرگەی لە کاتی گەشت و ماندووبوونیاندا، چۆن بە (نوکتەبازی) (وەزعی ئاڕازی) بەرجەستە کردووە. چۆن چۆنی دەستی بەفراو تەزیوی بەراورد دەکات بە کەلەپچەی جەلادەکان. کەسێکی ئاوا، کەسێکی ئاسایی نییە.

تێکۆشەرێک- جەستەی شەقار شەقاری ئەشکەنجە بێ؛ لەژووری زیندانی تەنیاییدا بەستێنراوێ؛ بڕیاری لە سێدارەدانی درابێ- لەسەر سیپارەی جگەرە و لەتە کاغەز ورەی ناخی خۆی و هاوڕێکانی، بکاتە ئەو یادگار و شیعرانە، کە شاعیری ئاسایی لە ئازادیشدا دژوارە بەرهەمی وا جوان بهۆنێتەوە. (کەسیشی بیر نەچووە، نامەی بۆ دێی کۆکە، کەس و کار، هاوڕێ نوسیوە)

بەش بە حاڵی خۆم زۆربەی هاوڕێ زیندانەکانی ئەوسای کۆمەڵە دەناسم، ئەوانەی یەکێتیش دەناسم، بەتایبەتی ئەوانەی ساڵانی (١٩٧٦- ١٩٨٢) کە خۆم بەرپرسیاری ڕێکخستنەکانی ڕاستەوخۆی کۆمەڵە و بەشێکی زۆری یەکێتیش بوم لە سەرانسەری کوردستان و عێراقدا، بۆ ویژدان دەڵێم: لە دوای شەهید شەهاب (سلێمانی)، شەهید جەعفەر (کۆیە)، شەهید جەمالە ڕەش، شەهید جەمال تایەر، شەهید مامۆستا عەزیز مەحمود (سلێمانی)، شەهید وەستا ئەنوەر (هەڵەبجە)، شەهید عەبدوڵای ئاێشێ و شەهید سمەی قاسم (سلێمانی)، شەهید ملازم جوامێر (مەندەلی- بەغداد)، شەهید سەلمان داود (فەیلی- بەغداد)، شەهید سەلام عبدالرزاق و شەهید یوسف حسین (خانەقین)، شەهید ئەسکەندەری حەیدەر رۆستەم (کفری)، شەهید محەمەد زەنگەنە (هەولێر)، شەهید عارف (کەرکوک)، شەهید لەتیف (ڕانیە)، لەو کاتەدا (مەلا عەلی) یش یەکێک بووە

لەو قارەمانانەی لە خۆڕاگریدا هیچی لەو شەهیدانە و هاوڕێکانی کەمتر نەبووە، گەرچی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتیش نەبوو، بۆیە دەتوانم بڵێم:

شەهید (مەلا عەلی) بیروباوەڕی چەپ و پێشمەرگایەتی و ئەدەبی، لە زینداندا کردە فێرگەیەکی خۆڕاگری تری شۆڕش، بەمەش شانازیەکی دەگمەنی لە مێژووی یەکێتی و شۆڕشدا، بۆ خۆی و بۆ مێژوو تۆمار کرد، بۆیە بە هەق نازناوی تێکۆشەرێکی دەگمەن شایەنێتی.

٢٠١١/٧/٢

## وەفا و شانازیی

لقی سلێمانی یەکێتی نوسەرانی کورد لە دوای نوێبوونەوە و پێکهێنانییەوە، وێڕای زنجیرەیەک چالاکی جیاجیا ژمارەیەک کتێبی چاپکردووە، کە ئەگەر چی هێشتا وەک ژمارە کەمن بەڵام بەشێکن لەو بەرنامەیەی لەبەردەستدان و هەوڵی تەواویش ئەدەین بۆ درێژە پێدان و بەردەوام بوونی.

یەکێک لەو کتێبانەی کە مافی خۆمانە شانازی پێوە بکەین ئەم بەرهەمەیە کە لە بەردەستی ئێوەی خوێنەردایە، بریتییە لە کۆی شیعرەکانی شاعیری بەهەڵوێست و شەهیدی زیندان (مەلا عەلی).

کە دەڵێین شانازی بێگومان، مەبەستمان ئەوەیە شانازی بەوەوە بکەین کە ئەرکێکی سەرشانی خۆمان لە بەچاپ گەیاندنی بەرهەمەکانی ئەم شاعیرە شەهید و بە هەڵوێستەی ناو زیندانی فاشستەکان بەجێهێناوە، چونکە شەهید (مەلا عەلی) هەر قارەمانی تفەنگبەدەستی خەباتی چەکداری نەبو بەڵکو تێکۆشەرێکی خاوەن ئەو قەڵەمە بەبڕشت و ئەو هەڵوێستە کوردانەیە بو کە دوای دەرچونی بڕیاری لە سێدارەدانیشی، ڕوبەڕوی جەلادەکان و دژی پەتی سێدارە وتی:

مەرگی ئاوا ناگۆڕمەوە بە سەد ژین
ژینێک سەرم بۆ دوژمن بێ بە پەرژین
سەربەرزییە کە پێڵاوم ئەبینن
بەسەرسەری دوژمنەوە لە بەرزین

راستە تائێستا شیعرەکانی (مەلا عەلی) چەند جارێ چاپ و بڵاوکراونەتەوە، بەڵام ئەم چاپەی لقی سلێمانی یەکێتی نوسەرانی کورد کۆی شیعر و نوسینەکانی ئەو شەهیدە نەمرەیە و لەم بەرگەدا و پێشکەش بە گیانی پاکی (مەلا عەلی) و هەموو شەهیدانی قەڵەم و بەرەنگاری دەکرێت ئومێدەوارین ئەم هەوڵە بچوکەی ئێمە لە ئاست گەورەیی شیعرو بەرهەمەکانی شەهیدی قەڵەم و بە هەڵوێست (مەلا عەلی)دا بێت.

یەکێتی نوسەرانی کورد/ لقی سلێمانی

تەموزی ٢٠١١

## ژیان نامەی شەهید مەلا عەلی
## بەدەست و خەتی خۆی

هاوڕێیانی بەڕێز پێشەکی سڵاوێکی کۆمۆنیستانەتان پێشکەش دێنم، داواتان کردبوو کورتەی بەسەرهاتم بنووسمەوە ئەوا بە شەرمەوە دەستم دایە خامە.

ساڵی ۹۵۳ لە دێی بەربەرد- ناحیەی ماوەت- قەزای شارباژێر لە دایک بووم باوکم نیوەکاری ئاغایەکی گەلاڵەیی بوو لەگەڵ دووماڵی تر لەو دێیە بچکۆلەیە نیشتەجێ بوون.

ساڵی ۹۵۸ بۆ رزگار بوون لە دەستی ئاغا ماڵمان ڕۆیشت بۆ دێی کۆکە- ناحیەی سورداش- قەزای دوکان. لەوێ لە جیاتی نیوەکاری بە سێ یەک توتنەوانیمان ئەکرد. وە هەتا ئێستاش ماڵمان هەر لەو دێیەیە. لەسەرەتادا گوزەرانمان باش بوو بەڵام نەبوونی کاسبکار لە باوکم بەولاوە هەروەها ئاڵۆزی و پشێوی وڵات وە زۆری خێزان وای لێ کردین کە لە ریزی چینی جووتیاری هەژار بژمێردرێین هەتا ساڵی ۹۶۹ ئیمە هەر بێگارمان کردووە بۆ ئاغا (بۆ حاجی برایم، شێخ رەوف شێخ لەتیف، عارف قەرەچەتانی). هەر ئەو چەوساندنەوەیە هەستمی بزواند

ئاوای لێ کردم لە چین و چینایەتی بکۆڵمەوە بەڵام هەستی نەتەوایەتی وەک هەموو کەسێک، قۆناغی ئێستای نەتەوەکەمان لە دەروونمدا دروستی کرد (بۆ ئەوەی چۆنیەتی زیانی ئێمە بزانن وە چۆنییەتی بیروڕا دروست بوونمان تێبگەن پرسیار لە برایەکەم بکەن کە ئێستا لە ئەبوغرێب زیندانییە- لەگەڵ ئەو بەیەک سک لەدایک بووین واتە دوانەین وە هەموو شێوەیەکمان لە یەکتری ئەچێ تەنانەت وێنەی یەکتریمان لێ گۆڕاوە ئەو ناوی (احمد مولود احمد)ە).

ساڵی ۹٦٧ چوینە ڕیزی یەکیەتی قوتابیانی کوردستانەوە، ئەوەی بە یەکەم مامۆستای ئەزانم برادەرێک بوو لە ئامادەیی کشتوکاڵ بوو ناوی فاروق عمر بوو هەر ئەویش داوای لێ کردین بچینە ڕیزی پ.د.ک و هەر لە ناوەندی بووین وەرگیراین بە ئەندام وە ئەوەی زاخاوی بیری داینەوە بڵاوکراوە نهێنیەکانی پارتی بوو وەک

بروسکە، خەبات، چەکی خەبات، رزگاری ... هتد وە ئیمەش بە لای باڵی چەپدا لامان دا.

لە قۆناغی ئامادەیی بوین هاوڕێیەکی کۆمەڵە لە پارتیدا ڕێکخەرمان بوو بەڵام ئەو کاتە هەستم بە بوونی کۆمەڵە نە ئەکرد. لەگەڵ ئەو برایەم هەموو هەفتەیەک جارێک کۆئەبووینەوە بۆ خوێندنەوە هەتا لە ساڵی ۹۷۲ لە کۆمەڵە ڕێکی خستین ئەو هاوڕێیەش شەهید هیوا عبدالغفور بوو هەروەها شەهید حمە صالح ساسام زۆر خۆی لەگەڵ ماندووکردین و خۆم بە قوتابی هەردوکیان ئەزانم.

ساڵی۹۷٦ لە ناوچەی سورداش ڕێکخراوی تۆڵەیان بۆ کردینەوە و شەرەفی لێپرسراوی ئەو ڕێکخراوەیان بە من بەخشی، منیش لەسەرو توانای خۆمەوە بە شانازییەوە کارم کرد وە کارکردن بەو پەڕی نهێنیەوە بوو بەڵام بە داخەوە چۆڵ بوونی ناوچەکە بڵاوەی بە هاوڕێیان کرد ساڵی ۹۷٦ کاتێ هاوڕێیانی سەرکردایەتی گیران ڕێکخەری ئێمە ورەی بەردا و وای

بروسکە، خەبات، چەکی خەبات، رزگاری ... هتد وە ئیمەش بە لای باڵی چەپدا لامان دا.

لە قۆناغی ئامادەیی بوین هاورێیەکی کۆمەڵە لە پارتیدا ڕێکخەرمان بوو بەڵام ئەو کاتە هەستم بە بوونی کۆمەڵە نە ئەکرد. لەگەڵ ئەو برایەم هەموو هەفتەیەک جارێک کۆئەبووینەوە بۆ خوێندنەوە هەتا لە ساڵی ۹۷۲ لە کۆمەڵە ڕێکی خستین ئەو هاورێیەش شەهید هیوا عبدالغفور بوو هەروەها شەهید حمە صالح ساسام زۆر خۆی لەگەڵ ماندووکردین و خۆم بە قوتابی هەردوکیان ئەزانم.

ساڵی۹۷٤ لە ناوچەی سورداش ڕێکخراوی تۆڵەیان بۆ کردینەوە و شەرەفی لێپرسراوی ئەو ڕێکخراوەیان بە من بەخشی، منیش لەسەرو توانای خۆمەوە بە شانازییەوە کارم کرد وە کارکردن بەو پەڕی تێهێنیەوە بوو بەڵام بە داخەوە چۆڵ بوونی ناوچەکە بڵاوەی بە هاورێیان کرد ساڵی ۹۷٦ کاتێ هاورێیانی سەرکردایەتی گیران ڕێکخەری ئیمە ورەی بەردا و وای

لە ئێمە گەیاند کە کۆمەڵەکە وازی لەکار هێناوە و حەل بووە. هەر لەو ماوەیەدا ابراهیم حسن بوو بە ئاسیاوم و وای تێگەیاندم کە خۆ بە مارکسی زانەکان ئەیانەوێ ڕێکخراوێکی نوێ دروست بکەن منیش بەویەڕی حەماسەتەوە هاوکاریم لەگەڵ کردن هەتا لە کۆتایی ئەو ساڵەدا بۆم دەرکەوت کۆمەڵە لە کار نەکەوتووە و هەر بەردەوامە لە ئیش و وە ابراهیم حسن لەلایەن (..........) ئاوێکەوە راسپێردراوە. من لەو کاتەوە وازم لێ هێنان و خۆم گەیاندە برادەرێک کە شکم لێی بوو لە ڕێکخراوێکی مارکسی کاردەکات وە داوام لێ کرد هەندێ شتم بۆ ڕوون بکاتەوە لە پاشدا داوام لێکرد کە بەرنامەی کۆمەڵەم بۆ پەیدا بکا. بەڵام پێش ئەوەی ئەو ببینمەوە. .................. وون بوو وە پاش هەفتەیەک دەرکەوت کە گیراوە من نەمویست ڕابکەم چونکە وازم لێ هێنابوون بەڵام کە زانیم لە دووم دەگەڕێن ڕامکردە دەرەوە.

ئەوەی کە سەلماندی ........... و هاوکارەکانی بوودەڵە بوون ئەو تیترافە نارەوایانە بوون کە کردیان لەسەر ئەو خەڵکە زۆرە تەنانەت لەسەر ئەوانەش کردوویانن کە هەر مناقەشەیان لەگەڵ کردبوون.

پێش دەرچوونە دەرەوەم زۆر برادەرم لێ پەشیمان کردبوونەوە بەڵام بە داخەوە هەموویان گیران، لەوانە محمد حمەکەریم خەلیفەو سەردار حمە امین و نیهاد خلیل کە هەرسێکیان بەوپەڕی تواناوە خزمەتی مارکسیزمیان ئەکرد.

لە دەرەوە یەکەم کەس کە چاوم پێ کەوت شەهید ئازاد و شەهید شوان بوون لەگەڵ هاوڕێ مەلا بەختیار بەیەکتریان ناساندین لەپاشان لەگەڵ هاوڕێ دلێر و هاوڕێ شێرکۆ (حسینی تاپۆ) ئەوان لە هەموو قسەیەکم ئاگادارن و ئەتوانن پرسیاریان لێ بکەن (وە هاوڕێ شێرکۆ لەزۆر شتی برایەکەم ئاگادارە و ئەتوانن پرسیاری

لێ بکەن لەو ڕووەوە) لەگەڵ هاوڕێ شیرکۆ چووین بۆ تالان بۆ لای هاوڕێ شەماڵ (شێخ محمدی باخ) و هاوڕێ جمال علی باپیر و شەهید احمد فتح الله پاش چەند مانگێک مانەوەم لەوێ لەگەڵ هاوڕێ شەماڵ چووین بۆ قەراخ ماوەیەکیش لەوێ ماینەوە.

شەهید شاسوار بڕیاری دا بچمە ناوچەی سورداش منیش خۆم حەزم نەکرد بۆ ئەوەی بتوانم سەرپەرشتی ماڵەوەش بکەم چونکە باوکم لەسەر من گیرابوو برایەکەشم لەسەر خۆی حوکم درابوو. شەهید شاسوار لە بڕیارەکەی پەشیمان بۆوە و ووتی ئەبێ لەگەڵما بێی بۆ مەکتەبی سیاسی و ببێ بە نوێنەری قوتابیان بەڵام من داواکاری ئەوم قبوڵ نەکرد چونکە دەمزانی ئەو ئیشەم بێ بەڕێوە ناچێت وە لە ماڵەوەش دوور دەکەومەوە.

دوای ٩ مانگ باوکم بەرەڵا بوو منیش لەگەڵ هاوڕێ شەمال چووم بۆ قەندیل و ماوەی چوار مانگ لەوێ مامەوە. ئێستاش شانازی بەو ماوە کورتەی ژیانمەوە دەکەم کە لە قەندیل بەسەرم برد و توانیووم هاوڕێیان لە خۆم ڕازی بکەم بە تایبەتی کاک نەوشیروان و مامە و مامۆستا جەعفەر و هاوڕێ جەمال و ...هتد.

پاش ئەوە گەڕامەوە بۆ ناوچەی دوکان و لەسەر بڕیاری هاوڕێ بەکر حاجی سەفەر و بە ڕەزامەندی هاوڕێیان (دلشاد و شێخ صدیق و کاک جەمال) و شەهید مامۆستا غەفور لێپرسراوێتی ناوچەم لە ئەستۆ گرت (ناوچەی زێلوان) ئەمەی جێی داخە نەمتوانی وەکو پێویست ئیش بکەم چونکە هاتبووینە سەر لانەی وێران هەریەکەش تووشی هەزاران گیروگرفت ببوو، تەنها هاوڕێ جەمال بوو خۆی لەبەر

ڕائەگرت، زۆرزۆر سوپاسی هاوڕێیان ئەکەم کە زۆر خۆیان ماندو ئەکرد بۆ پڕکردنەوەی کەم و کورتییەکانی هەرێمەکە.

سەرەڕای ئەمە وەکو کادرێک لە سورداش ئیشم ئەکرد چونکە ناوچەکەمان کادری کەم بوو، غەریب عبدالقادر نەقڵ بوو، هاوڕێ صلاح زۆر لەو سیانەی دوایی ڕازی بوو وە ئامادە بوو هەر لەگەڵ ئەوان بگەڕێ بەڵام ئێمەی وەلانابوو تەنانەت داوای لە شەهید مارف ئەکرد کە جیمایەی تایبەتی ئەو بێت لەو ڕووەوە پرسیار لە خاڵە شێخ صدیق و هاوڕێ دڵشاد بکەن.

چۆنیەتی گیرانم بۆ نامەیەکی تر

هاوڕێتان (ملا علی) حسین مولود احمد

## نامەی شەهید مەلا عەلی
## بۆ شەهید دڵشاد

هەمیشەت باش

هاوڕێی زۆر زۆر خۆشەویستم کاکە دڵشاد.

سەرەتا گەرمترین سڵاوی کۆمۆنیستانەت پێشکەش بێت. هیوام خۆشی و شادی و بەختەوەریتە. ڕێز و سڵاوم هەیە بۆ هەموو هاوڕێیان وە پێشمەرگەکان. چاوەکەم نامەوێ یەک یەک ناوەکانیان بنوسم بۆ خۆت وەکیل بەو یەک یەک سڵاوی منیان پێڕابگەیەنە بە مامۆستاکانیش هەموویان، هاوڕێ گیان ئەمەوێ دەربارەی چۆنیەتی گیرانمان چەند شتێکت بۆ بنووسم:

خاڵە شێخ صدیق ئەزانێ چۆن من و هاوڕێ مارف وە هاوڕێ جەمال لێ یان جیابووینەوە وە عەلی باپیر ئەزانێ چۆن هاوڕێ مارف لەگەڵم هات وە بۆچی. لە هەناران جەماعەتمان بەجێهێشت شەو لە زێوێ ماینەوە. پاش نیوەڕۆی

شەهید دڵشاد توفیق

دوایی بە ڕێگایەکی نهێنیدا ڕۆیشتین بە بێ ئەوەی لابدەینە هیچ دێیەک چووین بۆ ماڵی خۆمان دوو شەو ماینەوە. ئنجا هەواڵمان نارد بۆ خاڵی شەهید مارف و هات وە بڕیارماندا ڕۆژی جومعە ڕێکەوتی ١/٣١ لە قازان چاوەڕێی عمری برای مارف بین بەشکم کەس و کاریشیان لەگەڵ خۆی بهێنێ. هەر لەو دوو ڕۆژەدا خەڵک زۆر هاتن بۆ دیدەنیمان. لەوانە یەکێک لە لایەن نوری حاجی گوڕون قەرەچەتانیەوە کە لە لیژنە مەرکەزییەکانەوە هاتبوو بۆ ئەوەی ئەندامێکیان بهێنێ و ئیمە ڕەوانەی بکەین بۆ مەکتەبی سیاسی لەبەر ئەو هاتوچۆ زۆرە بڕیارماندا ماڵی خۆمان بەجێبهێڵین و چووین بۆ کرزە بۆ ماڵی خدر قادر باپیر ........ .

بەیانی زوو هەتا دنیا ڕووناک بووەوە حەرەس بووم لە پاشان هاتمەوە ژوور، نانمان خوارد و هەتا سەعات(١٠) هیچ ڕووی نەدا ئنجا ژنی خدر بە پەلە هات ووتی جەیش لە جادەوە هاتە خوار، هەتا ئێمە هەستاین و هاتینە دەرگا بۆ ئەوەی دەرچین ووتیان گەیشتۆتە ناودێ، ئێمەش بێ ئەوەی هیچمان لێ بەجێبمێنێ دەرچووین و چووینە ناو چنارەکانی بەرناودێ بە هێواشی گەڕاین، یەک دوو کەسی گرژەیی لە ناو چنارەکان بوون، لەبەر ئەوەی خۆمان پتر بپارێزین لەوانیش ڕەت بووین و ئامۆژگاریمان کردن کە قسە نەکەن.

شەهید مارف ووتی چی بکەین ووتم بابزانین جەیش کوێ ئەگرێ، لە لایەکەوە سەرنجمان دا جەیش ئەهات دەوری چەو پێشەڵانەکە بگرێ و ئێمەش بە خێرایی داگەڕاین زۆری نەمابوو بگەینە ناو پەڵە چنارێکی گەورە لە دواوە بانگیان کردین هیچ ئاوڕمان لێ نەدانەوە گەیشتینە سەرچەم و پەڕینەوە، ئەوبەری چەمەکە ساڵان پەڵە چنار بوو ئەمساڵ بڕیبوویان هەرچۆن بوو خۆمان گەیاندە جۆگایەکی قوڵ و بەرەو لای چەرمەگا ڕۆیشتین دیمان پێشەوەمان بە مغاوێر گیراوە، شەهید مارف ووتی با خۆمان بکوژین منیش ووتم با جارێ ئێمە ئەوان بکوژین کە زانیمان دەرناچین ئەوسا

هەرچی لە پێشماندا بوو داماندە بەر سەڵیە ئینجا بەرەو دواوە گەڕاینەوە، شوێنی قاچمان زۆر بە ئاشکرا دیار بوو لەناو جۆگاکە حەقیبەکانمان شاردەوە هەر لە جۆگاکەدا. کەمێکی تر ڕۆیشتین دیمان دواوەش گیراوە و بەرەو ڕوومان دێن وە هەتا دێ دائرەکە تەسک دەبێتەوە بە تەقەکردن خۆمان گەیاندەوە قەراغی چەمەکە و ویستمان بپەڕینەوە بۆ جۆگای ئاشی فایەق (ئەگەر بگەیشتینایەتە ئەوێ دەردەچووین چونکە ڕوو دەکاتە ناو چنارەکانی گولیجە و کۆکە) بەڵام هاوڕێ عارف ووتی با خۆمان بخەینە ژێر تورکەوە گەڕاین هیچمان نەدۆزیەوە ناچار بەرەو جۆگاکە ملمان لە چەم

نا نەمان زانی چەمەکە هێندە قوڵە بە تفەنگەوە نقوم بووین، تفەنگەکانمان کەوتە گۆمەکەوە و ئێمەش بەپەلە خۆمان گەیاندە قەراغی ئاوەکە، ئاوەکە قوڕاو بوو خۆمان لە ئاوەکەدا نقوم کرد هەتا ملمان لە دوورەوە چاویان پێمان کەوت بۆمان هاتن و تەقەیان لێکردین من سەرم بریندار بوو انجا هاوارمان کرد تەسلیم بە خەیاڵمدا هات بڵێم بە کوێخا برایم مان ووتوە تەسلیمان بکاتەوە. لە کاتی لێداندا بە توندی هاوارم ئەکرد بۆ ئەوەی هاوڕێ مارف تێ بگا، بەڵا م ووتیان ئەی بۆ ڕاتان کرد وتمان چاوەڕێی کوێخا بووین و خەڵکمان دیوە و وتویانە جەیش ئەتانکوژێ. ووتیان کێ بوو ووتم نازانم ناوی چی بوو بەڵام بە ڕەنگ ئەیناسمەوە. منیان برد

بۆ ئاودێی کرژە و خەڵکیان کۆکردەوە ووتم بە کوردی پرسیاریان لێ ئەکەم ئەڵێم کێ ووتی ڕاکە. زابتەکە ووتی باشە منیش بە کوردی کەوتمە قسەکردن و ئەو ئیفادەیەم پێڕاگەیەندن کە حازرم کردبوو بۆ ئەوەی ئەوانیش بە کوێخا برایمی ڕابگەیەنن و لە ئیستیخبارات دیفاعمان لێبکات. (..............................................

.................................................................... ....................................

..........................)

هەر لەناو چەمەکە منیان پشکنی (٣٧٠) دینارم پێ بوو (٣٠٠)ی لە سلێمانیەوە هاتبوو ٧٠ دیناری (نەسریە)شم پێ مابوو عەسکەرەکان بردیان لەگەڵ دەفتەرێکی تەنزیمیەکان وە دەفتەرێکی جاسوس و پیاوخراپ، اعترافی من بە زۆری لەسەر ئەوانە بوو کە زانیم ڕایان کردوە. ئەوانەی لەگەڵما بوون هەموو تەبریە بوون چونکە هیچ شتێکم لەسەر نەووتن و تەعزیبی هەموویانم خستە سەر خۆم، ..............................................................................................................................

............ .

بەڵام تکام وایە محاسەبەی (............ و ............) بکەن چونکە دڵنیام قسەی ئەوان وای لە حاکم کرد موئەبەدم نەکات و بڕیاری خنکاندنم بدات.

هاوڕێت مەلا عەلی

## کورتەی ژیانی شەهید حسەین مولود ئەحمەد
## (مەلا عەلی)
## بە پێنوسی (ئەحمەد مەولود)ی برای

ساڵی ١٩٥٣ لە دێی بەربەردی ناوچەی ماوەت لەگەڵ ئەحمەدی برایدا لە دایک بوون. (ئەم دوانەیە ئەوەندە لە یەکتری چون کە وێنەی یەکێکیان بۆ هەردوکیان بەکار هاتووە.) سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ چونەتە دێی کۆکە لە ناوچەی سورداش. ساڵی خوێندنی (١٩٥٩-١٩٦٠ ) چوونەتە قوتابخانەی سەرەتایی و ساڵی (١٩٦٦-١٩٦٧) چوونەتە قوتابخانەی ناوەندی (وەتەن). حسەین مولود ساڵی خوێندنی (١٩٧١-١٩٧٢) چۆتە ئامادەیی سلێمانی کوڕان بەشی ئەدەبی و چۆتە ریزی رێکخستنەکانی (ی.ن.ک) و(پ.د.ک) و (پ.ش.ک)، بەهۆی بیروڕای پێشکەوتن خوازی و چالاکی و جموجۆڵەکانی لە پارتی دوور خراوەتەوە و هێشتا قۆناغی ئامادەیی تەواو نەکردبوو کە پەیوەندی کردبوو بە ئەلقە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەوە و دواتریش بووە بە ئەندامی کۆمەڵەی مارکسی لینینی. ساڵی ١٩٧٤ وازی لە خوێندن هێناوە لەبەر بارودۆخی ناهەمواری ئەو کاتە و گەڕاوەتەوە بۆ کۆکە و لە ناوچەی سورداش کراوە بە لێپرسراوی رێکخراوی (تۆڵە)، لەسەر داوای هاورێیانی گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و درێژەی بە خوێندن داوە و قۆناغی ئامادەیشی تەواو کردووە و لە بەشی کوردی ئادابی زانکۆی سلێمانی وەرگیراوە و لەو ماوەیەدا ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامان و سەرکردایەتی کۆمەڵە گیران و

کاروباری ڕێکخستن و چالاکیەکان سست بوون و ئەمیش پەیوەندی پچڕا و ئاگای لە گۆڕانکاریەکان نەما، بە شێوەیەکی وا وای زانی بوو کۆمەڵە حەل کراوە، بۆیە کەوتۆتە سۆراغ کردنی ئەنجامی کۆمەڵە و دۆزینەوەی هاوڕێیان و هەوڵدان بۆ دروست کردنی ڕێکخراوێکی نوێ. دواتر هەستی کردووە کە کۆمەڵە هەر ماوە و ئەوەی تازە دروست ئەبێت ڕێکخراوێکی ترە، ئیتر چالاکیەکانی کەم کردۆتەوە و هەر وەک ئەندامیکی سادە لە ڕێکخراوی ڕەنجدەران دا ماوەتەوە و بەر لەوەی بە هۆی کۆمیتەی شارەوە پەیوەندی بە کۆمەڵەوە تازە بکاتەوە، ڕێکخراوی ڕەنجدەران لەلایەن دوژمنەوە هەستی پێکراوە و زوربەی ئەندام و لایەنگرانی ئەگیرێن، ئەویش دیسانەوە و بە ناچاری لە ڕۆژی ١٩٧٧/٥/١١ خوێندن بەجێ ئەهێڵێت و ئەچێتەوە ناو ڕیزی شانە چەکدارەکانی کۆمەڵە.

پاش چوونەوە ناو کۆمەڵە ئەنێردرێتە خولی کادیران و بەسەرکەوتویی خولەکەی تەواو دەکات و لە ناو هەڤاڵەکانیدا بە کادیری جەماوەری ئەناسرێت و ناوی لێ ئەنرێت بە (مەلاعەلی) و ئەکرێتە لێپرسراوی ناوچەی ژیلوان سەر بە قەزای دوکان.

ڕۆژی ١٩٧٩/١/٣٠ بە دەسیسەی خۆفرۆشان، ڕژێم لە دێی کرژەی ناوچەی سورداش لەگەڵ د.مارف دا دەسگیریان ئەکات و ئەنێردرێن بۆ هەیئەی خاصە لە کەرکوک. ڕۆژی ١٩٧٩ /٦/٦ بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەرئەکرێت و ڕەوانەی زیندانی موصل ئەکرێت و پاش نزیکەی مانگ و نیوێک لەگەڵ (ئەلوەند عومەر و عەلی عال) دا لە شەوی ٢٢ لەسەر ١٩٧٩/٧/٣٢ لە سێدارە ئەدرێن و شەهید ئەکرێن.

دایکی شەهید مەلا عەلی، ئەو ڕۆژانەی ئەچوو بۆ مواجهەی کوڕەکەی،

قایل بوونی خۆی بەرامبەر هەڵبژاردنی ئەو ڕێبازەی کورەکەی و هاوڕێکانی دەربڕیوە و دڵخۆشی زیندانیان و کەس و کاریانی داوەتەوە و کارێکی وا جوانی نواندووە کە نازناوی دایکی شەهیدی پێ بدرێت.

شەهید مەلا عەلی لەکاتی بردنیدا بۆ بەرپەتی سێدارە بە مەلاکەی وتووە بە تەڵقینی تۆ ڕازی نابم چونکە هەر ئێوەن کە قەڵاچۆی ئازادیخوازان ئەکەن.

لە دوا مواجهەدا بەتانیەکی بەدەستەوە بووە و بەکەس و کار و هاوڕێیانی وتووە ئەزانن ئەمە بەتانی کێیە؟ ئەمە بەتانی شەهید مامۆستا عەزیزە، تا ئێستا خۆم بە بەجێماوی کاروانی ئەزانی، بەڵام ئێستا بەختەوەرم کە بەتانیەکەی ئەو من پێی ئەخەوم لێم مەعلوم بووە کە ڕاستە من شوێن پێیەکەیانم ون نەکردووە و دڵنیام لەوەی بۆ ڕۆیشتن بەرەو ئاسۆ جێ نامێنم و ئێوەش بەرێزینە لەناو کاروانی کەس و کاری یەکتریدا جێی خۆتان چۆڵ نەکەن.

زۆربەی شیعرەکانی ئەم دیوانەی لە ماوەی ئەو شەش مانگ و نیوەی ناو زیندانی موصل دا نووسیویەتی ناردویەتیە دەرەوە، جگە لەم شیعرانەش چەندین نامەی شۆرش گێڕانەی ناردۆتە دەرەوە بۆ هاوڕێ و هاوسەنگەر و ناسیاوەکانی کە تیایدا داوای خۆراگری و دڵسۆزیان لێ ئەکات و داوایان لێ ئەکات ڕیزەکانی گەل و شۆڕش پتەوتر بکەن دوا تکاشی لە هاوڕێکانی کۆمەڵە هەر ئەوە بووە کە ڕێبازی شۆڕشگێڕێتی ون نەکەن و لە کەم و کوریەکانی ببورن.

ئەحمەد مەولود
١٩٨١/١٢/٣٠
نیوزەنگ

## نازەنین حەسەن ساڵح
## براژنی شەهید مەلا عەلی وای بۆگێڕاینەوە

نازەنین حەسەن ساڵح لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٣) یەو خیزانی شەهید ئەحمەد مەولود و براژنی حسەین مەولود (مەلا عەلی)یە. ئەڵێت باوکم پۆلیس بوو لە بەغدا ماڵمان لەوێ بوو. خوشکی ئەحمەد زڕ دایکم بوو، کە لەتاو گەرمای بەغدا چووین بۆ کۆکە، پاش بەینێک من خوازرام بۆ ئەحمەد و خوا منداڵی داو کارمان زۆر بوو. کاکە حسێن هەمیشە ئەیوت نابێت ئەم ژنە بچەوسێتەوە و ماندوو بکرێت، کە ئەحمەد منی خواست، وتی با پێشەکی پێت بڵێم من و حسەینی برام تەلەبەین و سیاسین. حسەین لەگەڵ نەنکی لە سلێمانی و لە گەڕەکی شێخ محی الدین ئەژیا و ئەحمەدیش لە داخلی بوو، بە هێلکە فرۆشتن و فەقیری بەردەوامییان ئەدا بە خوێندنەکەیان. ئەحمەد گەیشتە سانەوی زەراعە و تەواوی نەکرد و لە دائیرەی زەراعە دامەزرا. کاکە حسەینیش گەیشتە پۆلی دووی کلیەی ئاداب، بەشی کوردی زانکۆی سلێمانی. رۆژێک گەڕایەوە بۆ کۆکە وتی لەوانەیە من خوێندنم بۆ تەواو نەکرێت. ئەحمەد نەقڵی ناحیەی هێرۆ کراو پاش چل رۆژ ناردیان بۆ دەرەوە بۆ ئەبوغریب و کە گەڕایەوە وتی ئەم جارە ژنەکەم و سێ منداڵەکەم لەگەڵ خۆم ئەبەم. ئەو شەوە کاکە حسەین قەراری دا واز لە خوێندن بهێنێت و بە ئەحمەدیشی وت ئاگات لە خۆت بێت، بەیانیەکەی کاکە حسەین خواحافیزی کرد و ڕۆیشتەوە بۆ سلێمانی بۆ ماڵی مامە سلێمانم لە گەڕەکی مەجید بەگ، ئیتر لەوێ سۆراغی وەزعەکەی کردبوو، زانیبووی کە ناوی

ئەویشی تیایە، بۆیە گەڕایەوە بۆ کۆکە. شەو شەهید (یاسین حاجی تانی) دووجار لایتی سەیارەکەی لەبەرماڵەکەماندا هەڵکرد و کاکە حسەین وتی ئەوە بە دوای مندا هاتوون و ئیتر رۆیشت و ماوەیەکی زۆر ئاگامان لێی نەما. رۆژێک لەگەڵ نەسرینی دشم چووین بۆ بژاری نیسک، کە ئێوارە گەڕاینەوە خانمی خوشکیان هاتبوو، دڵم داخورپا وتم خێرە وا هاتوویت؟ وتی تالبی حاجی موشیر گەبەیی وتی کە ئەحمەدم لەگەڵ سێ عەسکەر و ئینزیبات دا بینیوە و ئەحمەد کەلەپچەی لە دەستا بووە و تالبی بانگ کردووە، وتوویەتی دوو دینارم بەرێ، کە تالب لێی نزیک بۆتەوە پێی وتووە من پارەم ناوێت، بەڵام برۆ خەبەر بە ماڵەوە بدە. چووم بۆ فرقە و ئەمن و حامیە، کەسێک پێی وتم (ئەگەر پێت خۆشە ئەحمەد ببینیت ئافرەتێکم لەگەڵ خۆت بۆ بهێنە) وتم ئەحمەد ئیعدام کەن، ئەحمەدم هەر ناوێت، ئەگەر بۆ ئەو بینینەی من ئافرەتێکی کورد سەر شۆڕ و ڕیسوا بکەم، گەڕامەوە بۆ کۆکە.

دوو مانگی پێ چوو شەوێک گوێم لە دەنگێک بوو وتی براژن وتم کاکە حسەین ئەوە تۆی؟ وتی هێواش قسە بکە، جانتایەک و دەمانچەیەکی پێ بوو کە خاڵە برایمی لە کاتی بوون بە پێشمەرگەیدا بۆی کڕی بوو. وتی بیستوومە ئەحمەد گیراوە، ئەگەر لەسەر من گیرا بێت ئاسانە بەڵام ئەگەر لەسەر خۆی گیرابێت ئیعدامە، منیش خۆم نادەم بە دەستەوە چونکە کەسمان بەرنادەن و هەردووکمان کەشف بووین.

رۆژێک هەویرم شێلا بوو، تەماشام کرد لە سوسێ وە عەسکەر ئەهات و دابارین بەسەر ماڵەکەماندا، کەندووەکانیان هەڵڕشت و چی کتێب هەبوو دەریان هێنا و لەگەڵ تابعەکەدا بردیان، خەزورم لە سلێمانی بوو، جوابیان بۆ نارد کە

نەیەتەوە، بەڵام ئەو گەڕابووەوە بۆ کۆکە و گرتیان و بردیان بۆ دوکان و دوای ئەوە چەند گەڕاین بە دوایدا هەواڵمان نەزانی، دوو مانگێکی پێ چوو جوابیان بۆ هێنام کە داوای منی کردووە، منیش دەستێ جل و نەختێ ترێم بۆ برد، حاجی مەولود جلە چڵکنەکانی بۆ ناردمە دەرەوە و بەینێکی پێ چوو جوابم بۆ هات کە بچمە ئەمنە کۆنەکە مواجهەی بکەم. چونکە وتبوویان ئەوانەی لەسەر هاوسەر و کوڕ و برا و باوک گیراون ڕەوانەی جنوبیان ئەکەن، ئنجا چووم بۆ سجنی سەرەوە بۆ لای خەزورم، وتی بە حسەین بڵێن خۆی دەرنەخات و ئاگای لە خۆی بێت و هەواڵی ئەحمەدیشم بۆ بنێرن. هەشت مانگ بوو خەزورم گیرا بوو، جوابم بۆ هات بچم بۆ مواجهەی لە سەماوە، پێش ئەوە چوومە ئەبوغرێب و مواجهەی ئەحمەدم کرد وزانیم کە موئەبەد حوکم دراوە و پێنج هاوڕێشی ئیعدام کرابوون، کە سجنەکان هاتنە دەرەوە ئەحمەدم نەناسیەوە، دایکی سێ منالی بووم، ڕەنگ زەرد و لەڕ و لاواز و سەرڕوتاوە بوو، تەنها بە دەنگیا ناسیمەوە. وتم بۆ وات لێهاتووە؟ وتی لە هەیئەی خاصەی کەرکوک زۆر تەعزیبیان داوم، بەڵام لە ئەبوغرێب حاڵمان باشترە. ئەحمەد وتی: نازەنین تۆ ئازادی وازمان لێ دێنیت کەیفی خۆتە، مناڵم بۆ جێ دێڵیت هەر کەیفی خۆتە. وتم بۆچی ئەم قسانەم لەگەڵ ئەکەیت؟ تۆ باوکی مناڵەکانی منی و هەموو پیاوێک بە باوک و برای خۆم ئەزانم. ئیتر تا حکومەت عەفواتەکەی دا سێ ساڵی پێ چوو، هەموو جارێک ئەچووم بۆ مواجهەی.

کاکە حسەین لەو ماوەیەدا لە قەندیل پێشمەرگە بوو، ماوە ماوەش ئەهاتە کۆکە و سەردانی ئەکردین لە ماڵی ئاسکۆڵی خوشکم ئەبوو لە چەمی کۆکە، لەوێ دڕکەکە زۆر چڕ بوو وەکو مزراح شوێن دڕکەکەمان بۆ هەڵکۆڵی

بوو، کزیشمان وەکو دەرگا ئەدایەوە بە بەردەمەکەیدا. ئیتر هەموو جارێ بە ناوی حاجەت شۆرینەوە نان و چاو هەواڵمان بۆ ئەبرد. ئینجا کەوتمە گوێزانەوەی کاغەزی نێوان ئەحمەد و کاکە حسەین. کاکە حسەین کاغەزەکانی وەک چکلێت ئەپێچایەوە و من کە ئەچووم بۆ مواجهە تێکەڵی چکلێتی ترم ئەکرد و لەوێ ئەمووت ئەحمەد ئەم چکلێتەیان زۆر خۆشە.

خۆم زەرعاتم ئەکرد، جارێکیان کاکە حسەین، دڵشاد و حەمە رەزای لەگەڵ بوو (کە هەردووکیان خۆی تەنزیمی کردبوون و هەردووکیشیان شەهید کران) ئەو دووانە هەردووکیان یارمەتیان ئەدام بۆ شریت لێدانی توتن. بەڵام کاکە حسەین نەیئەوێرا خۆی دەرخات.

جارێکیان کاکە حسەین دوو سەعاتی بە دیاری بۆ هێنابووین یەکێکان بۆ حەسەنی برای و ئەوی تریان بۆ من. کە چووم بۆ مواجهەی ئەحمەد، وتی نازەنین ئەم سەعاتە جوانەت لە کوێ بوو؟ وتم ئەوە دیاری کاکە حسەینە، وتی سەعاتەکەم ئەدەیتێ، وتم موبارەکت بێت. پاش بەینێک نامەمان بە بەریدا بۆ هات باسی سەعاتەکەی تیا کردبوو کە موشکیلەی بۆ دروست کردووە و وتویانە ئەم سەعاتە ئێرانیەت چۆن دەست کەوتووە؟. کە چووم بۆ مواجهە لێیان پرسیم ئەم سەعاتە ئێرانیەت لە کوێ بوو؟ وتم پارەم بەنێ سەعاتتان بۆ بهێنم. ئەو جارە ئەحمەد داوای رەسمی هەمووماتی کرد و بۆ جارێکی تر کە چوومەوە رەسمی هەموویانم بۆ برد و رەسمی کاکە حسەینیشم بۆ برد.

رۆژێک چووم بۆ سلێمانی، دشەکەم وتی حسەینی برازام گیراوە. شەوێک بەر لەوە بە کاکە حسەینم وت ئەچم بۆ مواجهەی ئەحمەد پارەی وردەی دامێ

وتی ئەمە بۆ ئاسۆ، وتم وەڵا ئەییەم بۆ ئەحمەد چونکە لەوێ لە خانوتەکە شتی پێ ئەکرێت، پێشم وت لە چەمەکە مەمێنەرەوە چونکە چاڵە و ئاگات لە هاتنی جەیش و جاش نابێت. بەڵام ئەو بە قسەی نەکردم و بۆ بەیانی لەگەڵ د.مارفی برازای عەلی بچکۆڵدا گیرابوو. ئیتر ڕێگەی موسڵیشم گرتە بەر و هەموو جارێک نامەی پیا ئەناردمە دەرەوە و ئەیوت براژن ئەم نامانە باش بپارێزە تا ئەحمەد ئازاد ئەکرێت، با دواتر لە چاپی بدات.

چووم بۆ لای ئەحمەد نامەی کاکە حسەینم پێ بوو، نەسرینی خوشکی تاریخەکەی گۆڕی، چونکە کاکە حسەین دوو ڕۆژ بوو گیرا بوو. کە بردم ئەحمەد وتی ئەم تاریخە بۆچی گۆڕراوە؟ وتی من خەوم پێوە بینیوە وتویەتی قاچم دێشێ، ئەوان دوانە بوون، بە ئازاری یەکتریان ئەزانی.

گەڕامەوە چوومەوە بۆ موسڵ، کاکە حسین وتی ئەمجارە جگەرەم بۆ بێنە با لەسەر سیمەکانی نامە بنوسم و ئەبێت بۆم بەریتە دەرەوە و بشیان پارێزیت.

من زۆر بێتاقەت بووم (بێ پارە و بە گەرما و بە سێ کەسی سجن کراوەوە بە خەزور وخەسویەکی هەناسە سارد و سێ منالی خۆمەوە) وتی براژن خەمبار و بێتاقەت مەبە، خەڵکی یەک کوڕی نابێت، دایکم شەش کوڕی هەیە و چواری ماوە.

دیسان چوومەوە ئەبوو غرێب، ئەحمەد وتی توخوا نازەنین راستم پێ بڵێن حسەینت دیوە؟ وتم بەو خوایە پێرێ کاکە حسەینم دیوە. (سوێندەکەم نەئەکەوت چونکە لە سجن بینیبووم.)

صابر کۆکەیی گیرا بوو ئەو بەربوو چووم بۆ لای وتی ئەبێت بچیت بۆ

موسڵ. بەیانی زوو چووم بۆ ئەبوغرێب و گەڕامەوە کە بۆ سبەینێ بچم بۆ موسڵ. وتیان مواجهەی موسڵ پێش خراوە، بەپەلە چوومە تقلیات، سەعات شەشی ئێوارە بوو، لە سەیتەرەکە ڕێگەیان نەدام، زۆر پاڕامەوە وتم ئاخر مواجهەمان هەیە لە موسڵ، ئیتر ئیزنیان دام. گەیشتمە موسڵ لەوێ دایک و باوکی شەهید ئەڵوەندم بینی، ئەوانیش چاوەڕوانی چوونە ژوورەوەیان ئەکرد. پێیان وتین، تا سەعات حەوت چاوەڕوان بن. (وەرە رۆح بۆ دەرناچێت چاوەڕوانی ئیعدام کردنی کەس و کار بکەیت). سەعات حەوتی ئێوارە دەرگایان لێ کردینەوە و چووینە ژوورەوە. ئەڵوەند دڵی بە کچێکەوە بوو بە کەژاڵی خوشکی وت بۆچی وێنەکەیت بۆ نەهێناوم؟. عەلی عال مواجهەی نەهاتبوو، کاکە حسەین وتی براژن بڵێ من هاتووم بۆ مواجهەی ئەو با لە ژوورەوە بێتە دەرێ، ئیتر هەموویان هاتن و منیش عەباکەم بۆ ڕاخستن، وتی عەبامان بۆچی بۆ ڕائەخەی پاش ئێوە ئەکرێینە ژێر گڵەوە، جەلادەکەی پشان داین و وتیشی عەلی بیست دیناری پێیە بۆی بەرەوە بۆ ماڵەوەیان و وتیشی کە من ئیعدام کرام تەرمەکەشم بۆ ماوەی حەوت ساڵ حیجزی لەسەرە، بەڵام کە کوردستان ئازاد بوو هەرچۆنێک بێت بمبەنەوە، وەسیەتیشی کرد کە کراسی ڕەشی بۆ لەبەر نەکەین و شینی بۆ نەکەین ئیتر خواحافیزیمان کرد.

کاک عومەری باوکی شەهید ئەڵوەند وتی من ناڕۆمەوە چاوەڕوان ئەبم بزانم تەرمەکانتان بەرەو کوێ ئەبەن، ئیتر تەرمەکان لە تەلەعفەر نێژرابوون و ناسیبوونیەوە و نیشانەی کردبوون، چونکە قەبرەکانیان زۆر قوڵ نەکردبوو. چەند جارێک چوین بۆ سەرقەبران چوونەکەشیان پێڕەوا نەبینین و مەمنوعیان کرد.

کاکە حسەین ئیعدام کرا و چارەکێک دوای ئەوە حکومەت عەفواتی دەرکرد و غازی فازلی هاورێی بەر عەفواتەکە کەوت و پێی وتبوو ئەگەر تۆ بەرعەفوات کەوتی پێ لە ماڵی ئێمە مەبڕە.

کاکە حسەین دڵی بە کچێکەوە بوو، چووینە خوازبێنی باوکی داوای دووکچی کرد. کاکە حسەین وتی کچی شار زۆرە بیهێنم بەڵام من کچی ئازای دێم ئەوێت، ئیتر نسیب نەبوو.

ئەڵقەیەک لە قەبرەکەیدا بوو، ئەڵقەی کەسێکی نزیکی مامۆستا عەزیزی سەرکردە بوو، وتبوی من ئەم ئەڵقەیە ئەکەمە پەنجە بچکۆلەکەم بۆ ئەوەی بمناسنەوە، ((دیارە ئەو ئەڵقەیە ئەو ئاواتەشی بوو کە نەهاتەدی و لەگەڵ خۆیا برایە ناو گۆڕ)) ئیتر دوای ئازاد کردنی عێراق کە قەبرەکان هەڵدارنەوە ئەڵقەکە لە پەنجە بچکۆلەکەیدا بوو، لەگەڵ ٣٦ شەهیدی تردا هێنامانەوە و لە گردی ئابڵاخ ناشتمان، چەند ساڵ ئەو دوو برایە لێکتر دابڕان، بەڵام لە مردنەکەیاندا یەکیان گرتەوە و لە پاڵ یەکەوە نێژران.

دوا جگەرەی شەهید مەلا عەلی بەر لەسێدارەدانی

ئەو ئەلقەیەی کە شەهید مەلا عەلی پێناسراوەتەوە

قۆپچەی چاکەتی بیجامەکەی شەهید مەلا عەلی لە ناو گۆڕەکەیدا دۆزراوەتەوە

هەموو سەروەتی شەهید مەلا عەلی لە ناو گۆڕەکەیدا دۆزراوەتەوە

## نامەی ئەحمەد مەولود بۆ شەهید مەلا عەلی

هەموو کاتێکت باش

برای خۆشەویست حسین

گەرمترین سلاوت لێ بێت، هیوام سەرکەوتن و شادی تەندروستیتە.

سلاوم هەیە بۆ هەموو ماڵەوە وە بۆ هەموو دۆستانی کۆکە.

سلاوم هەیە بۆ عەلی حاجی کریم و ماڵەوەیان وە بۆ عبدالله فقی محمود.

ریز و سلاوم هەیە بۆ هەموو هاورێ و دۆستێک.

چاوەروانی هاتنت بووین هەتا رۆژی ٩/١٧ گەراینەوە غێرەدینم دی کە تۆی دیبوو وتی شەرێ کردووە و رۆژی پێشتر عەباس لە هێرۆ بوو وتی بە نیازە ٩/١٨ بێت. منیش ئەو کتێبەی دەستنیشانت کردبوو دام بە عباس بەو نیازەی جەژن ئەچین بۆ لای بەڵام هەواڵی غێرەدین (خیرالله) سەغڵەتی کردین.

کورێکی تر (محمد صادق عارف)م بە غێرەدین ناساند لەگەڵ یەکێکی تر.

کە هاتمەوە تعارفتان لەگەڵ دوو کوری تر پێ ئەکەم خەڵکی قەڵادزەن یەکێکیان لە علومە و ئەوی تر لە زراعەیە هەروەها یەکیکی تر لە هەندەسەیە.

براکەی سەردار - سالار - تقدیمی دارالمعلمین ی کردووە جار جار دیدەنی بکە.

کە هاتمەوە لە شتی تر ئاگادار ئەبیت.

دڵنیا بە کاتمان بە فیرۆ ناروات و بەرهەمێکمان هەیە.

برات احمد
١٩٧٦/٩/٢٠

## نامەی سەردار بۆ شەهید مەلا عەلی

بۆ هاوڕێ ی خۆشەویستم کاکە حوسێن

چاوەکەم جوانترین سڵاو لە پاکترین دڵەوە کام دڵ ئەو دڵەی شەیدای ڕوی گوڵ و لەنجە و لار و هاتوچۆ و چاوی کاڵ و ئەو شتانەی وەلاناوە و بوون بە شتێکی سانەوی وە بگرە زۆر جاران هەر نامێنن لەلام. وە خۆشەویستی نیشتمانم بۆتە سەرلەوحەی دین و ئیمان و هەموو شتێکم (جا نازانم دەڵێی چی لەو بارەوە ڕەنگە چاکم گوتبێ).

براله گیان ڕۆژی ٥ شەممە ١٩٧٦/١١/١٨ هاتم بۆ سلێمانی لەبەر ئەوەی اجتماعمان هەبوو اجتماعی (مساح و مەسئول ئەرازی هەموو فەرعەکان) لەگەڵ کاک ڕەزا هاتم بۆ جامعە لە استیعلامات پرسیمان گووتیان بچن بۆ یەکیەتی ئیمەش هاتین لە حەوشەکە پرسیمان وە ئەوجا هاتین بۆ اتحاد وە سەیری جدولمان کرد ئێوە دەوامتان هەبوو کاتژمێر ١١,٢٥ بوو ئیمەش بۆ نەگبەتی کاتژمێر ١١,٣٠ اجتماعمان دەستی پێدەکرد جا لەبەر ئەوە نەمتوانی بمێنمەوە

وە بە دیدارت شاد نەبووم. بەڵام هیوادارم ئەو پارچە کاغەزە کوڵ و کۆمان دامرکێنێ. بەڵام چاوم لە ڕێیە بۆ جەژن لە دوان یەک.

ئیدی بە هیوای دیدارم. لە کاک محمدی ڕەفیقتم پرسی گوتی چۆتەوە کۆکە وە لەبەر خاتری کاک ڕچا دە تا باوەڕت بی نیازم بوو بێم بۆ کۆکە بەڵام کاک ڕەزا نەیهێشت، شەو علی حاجی کریم هات بۆ لامان گوتی حوسێنی نابینم، وە باسی ئەو نوسراوەی کرد کە لەلایەتی دەیویست بۆت بێ نێتەوە.

کاکی خۆم توبی
ئەو خوایەی چۆنی
هاوڕێت سەردار
هەینی ١٩٧٦/١١/١٩

## نامەی فەزیلە* بۆ شەهید مەلا عەلی

برای بەریز کاکە حسین

پاش سلاو کردن وە بە بۆنەی نزیک بوونەوەی جەژنی نەورۆزی پیرۆزەوە گەرمترین پیرۆزبایی پێشکەشی تۆ و هەموو پێشمەرگەیەکی دڵسۆز،

بە هیوام ئەم چەند ووشە کورتە وەڵامێک بێ بۆ نامە ڕازاوەکەی تۆ. لەگەڵ چاوپۆشی کردن لە کەم وکوڕیان ..

بە دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕۆژەی یەکترمان ناسی، ڕێم کەوتە دێکەی ئێوە و ئاشنایەتیم لەگەڵدا پەیداکردن لەمەش زیاتر کە بیستمان ڕۆژی پێنج شەممە شایی دەکرێت ئیتر چاوەڕوانمان کرد تا لەم ئاهەنگەدا بەشداری بکەین ئەگەر ماوەیەکی کورتیش بخایەنێت وە بەتاییەتی دوای ئەوەی کە زانیم ئەم شاییە ماڵی ئێوەن چونکە کورتە زانیاریەکمان دەربارەی تۆ و براکەت هەبوو ....

ئەم حەز کردنەشمان بە نیازێکی پاک بوو نەک بە نیازی (جاسوسی) وەکو وتراوە، بەڵام ئێمە هیچ کاتێ لەم وشانە دڵگیر نابین چونکە کێ ئاگاداری ناخ و ناوەڕۆکی کێ یە زۆر جار خەڵکی بە ڕواڵەت هەڵەخەڵەتێن و تووشی جۆرەها هەڵە دەبن .

وە ئەم جۆرە ڕووداوانەش زۆرە چونکە هەموو کارێک کاردانەوەیەکی لەدوایە ئیتر بە هەچ جۆرێک بێت.

ئەگەر بێ دینم گەر بێ ئیمانم
ئەگەر سەرخۆشی مەیخانەکانم
هەر کەس بە جۆرێ لە من تێ دەگا
منیش هەر ئەوەم کە خۆم ئەیزانم

بەڵام نامەکەی ئەم جارە ئاڕاستەم کرا جیاواز بوو لە نامەکانی پێشو.....

ئەتوانم بڵێم ڕۆمانێک بوو .. بۆیە ئەڵێم ڕۆمان چونکە تەنیا خوێندنەوەی دوو ڕۆمانی کوردی بەو جۆرە کاریان تێ کردوم کە ئەوانیش (قەڵای دمدم) و (ژانی گەل)ە.

بەڵێ بە خوێندنەوەی ئەم نامەیە چەند جارێک (بۆیە ئاڵێم چەند جارێک لە کەسێ نەگەیشتبێتم بەڵکو لەبەر ووردی و پڕ مانایی هەریەکێ لە ڕستەکانی حەزم ئەکرد زیاتر لێ یان بکۆڵمەوە و بتوانم بە تەواوی لە مەبەستی نووسەر بگەم).

ئەو نووسەرەی کە توانی تەنیا لە دوو لاپەڕەدا دەروونی خێزانێکم پێ بناسێنێ وە ئاگاداری زۆر نهێنیم بکا کە درکاندنی ئەم جۆرە نهێنیانە تەنیا لە نێوان خوشک و برایەکی دڵسۆزدا ئەشێ.

وە ئەو ڕاستیانەی سەلماند کە لە پێش ناسینی خۆیدا بیستبووم زۆر زۆر سوپاس بۆ هەستی ئەو دەرونە پاکەت.

ئەوەی لێم روون نەبوبێ و گومانم لێی هەیە، ئەوەیە کە ئایا چۆن؟ کاکە حسین ئەم نامەیەی ئاراستەی ئێمە کرد، خۆزگە بمزانیایە کە پێشتر هیچ زانیاریەکی لە بارەمانەوە هەبووە.... کە ئەویش بۆ یەکێکی وەکو ئەو زۆر ئاسانە و لە هەمان کاتدا پێویستیشە.

وە ئایا ئەگەر منیش نەبوومایە هەمان نامە بە خوشکانی تر ئەگەیەنرا؟ ئەوەش بزانە کاکە حسین کە لە خۆم زیاتر هیچ کەسێک بەمە ئاگادار نییە و ناشمەوێت ئاگادار بن.

بەڵێ ئامادەبوونمان لەم ئاهەنگە جنجیلانەیەدا زۆر زۆر بەختیاری پێ بەخشین بە تایبەتی پاش ئەوەی کە بیستم برایەکی وەک تۆ لەوێ بوو وە حەز بە بینینی ئێمە دەکات وە منیش بەش بە حاڵی خۆم زۆرم حەزم دەکرد چونکە دەمێک بوو چاوەڕێ ی هەلێکی وا بووم. کەچی گەردونی چەپەل دەستێکی لەمیش هەلدا و ئەو ئاواتەی زیندە بە چاڵ کردین وە هەزارەها ئاواتی تر.

كل ما يتمني المرء يدركه

يجري الرياح بما لا تشتهي السفن

وە ئەوەی زیاتر ئێمەی دووچاری بارێکی شێواو کرد و کەوتینە دەریای ئەندێشە و بیرکردنەوە لە ئەنجامی ئەو رووداوە. هەڵچونە کت و پڕەکەی تۆ بوو کە هەرگیز شتێکی وا بە بیرماندا نەئەهات لەلایەن رۆشنبیرێکی وەک تووە.

بەڵام بە خوێندنەوەی نامەکەت و رونکردنەوەی ئەو هۆیانەی پاڵیان پێوە نابیت بۆ ئەم هەڵچونە ئەو تەمەش لە بیرمان دەرچوو. هەموو شتێکمان بۆ ساغ بوەوە...

بەڵێ رۆژی ٥/مارت/ بوو پاش تەواو بوونی کاتی محازەرەکەمان یەکێک لە بەشدارانی دەورەکەمان لێم نزیک بووەوە و نامەیەکی خستە دەستمەوە وتی: ئەمەیان بۆ تۆ ناردووە. منیش ئاسایی لێم وەرگرت وتم سوپاس وام زانی یەکێکە لەو نامانەی لەلایەن دانیشتوانی دێ وە پێشکەش کراوە وەک هەموو نامەیەکی تر لە زوربەی دێ یەکانی ئێمە روویان تێدەکەین و جۆرەها گیروگرفت و پێشنیازیان تێدایە .. بەو ئامانجەی ئێمە بە پێی توانا یارمەتیان بدەین لە چارەسەرکردنیاندا....

لە کۆتاییدا ئەڵێم خۆزگە شتێکمان دەربارەی بیروڕای ئێوەش بزانیایە سەبارەت بەم جۆرە چالاکیەی ئێمە لەناو لادێ کانی کوردستاندا ....

وە ئەگەر تێبینی و سەرزەنشتیەکتان بۆمان هەبوو وەک برایەکی دڵسۆز ئاگادارمان بکەن بەو جۆرەی کە لەگەڵ باری ئێستای کۆمەڵەکەماندا بگونجێ و ئەوەشتان لا ئاشکرا بێت ئەو بەرنامەیەی لای ئەوانەوە دائەنرێت وە بەو مەبەستەی ئەیانەوێ ناگەیەنرێت ... لەوانەشە خۆتان زۆر چاک بزانن وە ئێمە ئەوەی لەگەڵ باری لادێ کانماندا نەگونجێ هەرگیز نایکەین با هەزاری وەک ئەوانیش ڕێنماییمان بکەن و بیانەوێت.

ئێمە بەرژەوەندی ئەو چینە چەوساوەیەمان لا گرنگترە تا ڕەزامەندی دەستەیەکی زۆردار و چەوسێنەر. ئیتر هیوادارم لە مەبەستم بگەیت و ئەم نهێنیەش تەنها لای تۆ ئاشکرا بێت بەڵام لەگەڵ وەڵامی هەندێ لەو شتانەی حەز بە زانینیان دەکەم. وەک لەم چەند ڕستەیەدا دەستنیشانم کردوون لەسەرەوە.

لە کۆتایی دا و لەگەڵ ڕێز و سڵاودا ئەم کۆپلە هۆنراوەیەی ابراهیم ئەحمەدت پێشکەش بێت، ئەگەر چی ڕەنگە ڕەخنەش بگریت وە بڵێ ی جا بۆچی ترسنۆکی بەم پلەیە. بەڵام خۆ ئەمە هۆنراوەی من نیە بەڵکو زۆر لام پەسەندە.

لەبەر چاوی بەد لە ترسی بەدکار
دڵم دەکەمە گۆڕی یادگار
بە گریانی ووشک بە ناڵەی بێ دەنگ
دێنمە لەرزین تەختی کردگار

خوشکی بچوکت
فەزیلە
چوارشەممە ١٩٧٨/٣/٨

[illegible]

---

* فەزیلە حمە صالح رحیم دەرچووی کۆلێژی ئاداب بەشی کوردی زانکۆی سلێمانیە و خێزانی کاک کەمال قەرەداغی یە. لە ساڵی ۱۹۷۹–۱۹۸۰ توێژەری کۆمەڵایەتی بووە لە دائیرەی زراعەی سلێمانی و ئەو کاتە سەرپەرشتی کردنەوەی خولی زراعەی کردووە لە لادێ کانێدا و کە خوێندکاری زانکۆش بووە پەیوەندی بە ریزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەوە هەبووە و هەر لەو ڕێگەیەشەوە حسەین مەولود (مەلا عەلی) ناسیوە.

# نامەی شەهید مەلا عەلی بۆ (حاجی مەولود)ی باوکی

بۆ باوکی خۆشەویستم حاجی مولود
پێشەکی دەستەکانت ماچ دەکەم
دەستی دایکم و مامە حاجی و مامە محمود ماچ دەکەم سەلام لە براژنم و فاتمە و نەسرین و حەسەن و محمد و ئامین و ئامۆژنە خونچە و ئامۆژنە ئایشە و ئامۆژنە ئاسکە ئەکەم. چاوی رەحیم و محمد و شیرین و شنۆ و ئاسۆ و ئومێد و لەیلا و ئاوات و بەهرە ماچ ئەکەم. سەلام لە کاک حەسەن و ئەبوبەکر و پورە فاتمە و خالە ئەحمەد و خالۆژنە پرشنگ و مالی عبداللە دەرویش و حسەینی کاک حەسەن ئەکەم. سەلام لە ماڵی حسەینی حەمەاللە و ئەحمەدی مام عەبدوڵا ئەکەم هەروەها سەلام لە ماڵی فقی محمود دەکەم، سەلام لە ماڵی کاک صدیق ئەکەم، ئێستا لەگەڵ کاک ئەمال لەلای یەکین خەمی منتان نەبێت، جێگام زۆر چاکە، رەنگە وا زوو نەیەمەوە سەلام بگەیەنن بە ئەحمەدی برام و هەموو ئەوانەی هەواڵم ئەپرسن بە تایبەتی عبداللەی فقی محمود.

ئیتر خۆشیتان ئاواتمە
کوڕی خۆت
حسین
١٤ تموزی ١٩٧٨
کوێستانی قەندیل

## نامەی شەهید مەلا عەلی بۆ دانیشتوانی دێی کۆکە

بۆ دانیشتوانی دێ ی کۆکە

سڵاوێکی گەرمتان پێشکەش بێت ئاواتەخوازم لە پاش من ناخۆشی نەبینن.

خزمەکانم تەمەنی منداڵی و گەنجیم لەناو ئێوەدا بەسەر برد شانازی بەوەوە ئەکەم کە خراپەم بەرامبەر کەس نەکرد. هەبووە خراپەشی بەرامبەرم کردووە چاوم لێ پۆشیوە هەبووە خراپ لە من گەیشتووە بەڵام دوایی خۆی ڕاستی بۆ دەرکەوتووە. هەبووە گیروگرفتی خستۆتە ئیش و کارم بەڵام با ئەوە قەرزێنێت بەسەریانەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کە ئەڵێن چاو بە چاو ئەکەوێتەوە. من ناوی کەس ناهێنم بەڵام خۆیان باش ئەزانن بەڵام گەردنی هەموو کەس ئازاد بێت بێجگە ..........................................

ڕێز و سڵاوم هەیە بۆ عەلی و برایمی حاجی کەریم و علی ڕەحیم وە بۆ ماڵی حمە شەریف و صابر و فقێ محمود بە تایبەتی عبداللەی کوڕی

هەروەها بۆ ماڵی حمەشوکری و دایکی و جەماڵ وە بۆ ماڵی عەزیز و بایز و ڕەشید وە بۆ ماڵی حسین حمەالله و حاجی علی و دەروێش غفور وە بۆ ماڵی حاجی سعید و برایم و ڕەشیدی برای کوێخا علی وە بۆ صابری احمد دۆشاو وە بۆ ماڵی خەلیفە ڕەزا. وە بۆ گوڵنازی مەلا یاسین وە بۆ لوتفی مەلا ڕەشید و عوسمان و مەلاژنە فاتم، وە سڵاوم هەیە بۆ عزیزی حمەامین و دایکی وە بۆ ماڵی خاڵە احمد(خزم) وە بۆ ئەو ماڵانەی ناوەکانیانم بیر نییە بۆ هەموویان.

سڵاوی تایبەتیم هەیە بۆ .................. و لەلایەن منەوە گەردنی ئازاد بێت و خوا ئەوانە بگرێت دوزمان و فیتنە بوون لە پێش هەموویانەوە ......، من خۆم بە تاوانکار نازانم بەرامبەر بە ئەو بۆیە داوای گەردن ئازادی لێ ناکەم ئەویش خۆی و ویژدانی، بەڵام گەردنی ........ و ..... هەرگیز ئازاد نەبێت لەگەڵ ئەوانەی کە خۆم ئەزانم، انشاوالله بە دڵی خۆی شوئەکا. ماوەتەوە ئەوانەی تۆزێک لێیان عاجزم

وەک ............ ، کە ئەڵێم گەردنی ئازاد بێ بەڵام گلەیی لێ بێ ئەوا خۆی نەخۆش بوو خۆ براکانی لەشیان ساغ بوو بۆچی دیار نەبوون. کە هەر نەبێ ئێواران لەسەر کانی لەبن کەپری تەماتە دائەنیشتین و قسەی خۆشمان ئەکرد، ئێستا ئەبێ کێ لەگەڵیان دانیشێ. ئەبێ کێ بێ جوابی هەموو پرسیارێکی بداتەوە.

..........................................................................................................

............................................................................ .

ئەمجارەش سڵاوم هەیە بۆ عەلی و برایم زۆر زۆر مەمنوتتانم.

ئیتر خواحافیز

حسین

## نامەی شەهید مەلا عەلی بۆ (ئەحمەد مەولود)ی برای

هەمیشەت باش

برای زۆر زۆر خۆشەویست و دووره دیدار .. پێشەکی لە ناخی دەرونەوە لە کاتی چاوەڕوانی مردنێکی پڕ شانازی و سەربەرزیدا گەرمترین و جوانترین سڵاوت لێ بێت، ئاواتە خوازم وەک هەموو کوردێکی چەوساوەی برا کوژراو سەبوری بە دڵتا بێت و لە جیاتی خەم و خەفەت بزەی شانازی کردن هەمیشە لەسەر ڕووت بێ. چاوەکەم هەزاران کەس لەم ڕێیە پیرۆزەدا گیانی خۆیان بەخت کردووە و براو کەسیان لەپاش بەجێ ماوە. وەک من ئەمڕۆ دەربەستی مردن نایەم نابێ تۆش دەربەستی ئەوە بێی کە منت لێ ون بووم، تۆش وەکو هەزاران هەزار ئەو برای شەهیدانە. دەبێ تۆ دڵخۆشی دایک و باوکم بدەیتەوە کە نابێ دڵتەنگ بن ئەوانیش وەکو

دایک و باوکی شەهید ئارام و شەهید شەهاب و شەهید مامۆستاغەفور و فتح الله ئاغا و هەزاران دایک و باوکی تر، سەرەڕای ئەوە. ئەوان پێنج کوڕی تریان ماوە با وابزانن منیان هەر نەبووم وە دەبێ تۆ ئەو قسانەیان بۆ بکەیت. من شانازی بەوەوە ئەکەم کە دژی زۆر و ستەم ڕاوەستاوم و بەربەرەکانیم کردووە بەڵام بێ تاوانێکی وەکو شەهید حەمە یاسین حەمەامین ئەوەشی نەکردووە تێدا چوو، ئیتر بۆچی ئێوە دڵتان بە خۆتان بسوتێ. چاوەکەم مردن شتێکی وا نییە من لێی بترسم، خەمم نەبینینەوەی ئێوە بوو بە تایبەتی هی تۆ چونکە پتر لە دووساڵ و نیوە بە ئومێدی بینینەوەی من بووی حەزیشم کرد کە منت نەدی لە مواجەهە چونکە برینت تازە ئەبۆوە.

چاوەکەم بە دەمیش وەسیەتم کردووە بەڵام وا بۆت دووپات ئەکەمەوە! هەمیشە سەر لە هاوڕێکانم بدە بە تایبەتی سالار و نیهاد و دانیشتوانی قەڵادزە. هەروەها محمد حمە کریم و مەلا محمود وە علی ڕەسمچی و حەسەنی برای کە مامۆستایە و داوای لێ بکە مامۆستاکانی گاپیلۆن و یاخسەمەرت پێ بناسێنێ کە منیان ئەناسی، وە هەمیشە سەر لە ماڵی سەردار بدە. هەروەها غازی فازل حسن کە دانیشتوی سەنگەسەرە و لەگەڵ خۆم لەژووری ئیعدام بوو وەکو من تەماشای بکە. چەند شریتێکم لای ئامۆژنم داناوە مەیان فەوتێنە هەتاهەتایە. هەموو ماڵە ئاسیاوێک وێنەیەکی منیان بدەرێ و ئەو شیعرانەی لەپاش خۆم بە جێماون بیانپارێزە.

هەوڵ بدە لەکاتی خۆشیدا واتە دوای سەرکەوتن خۆت بە مامە بناسێنە یان خۆت بە نوشیروان یان مەلا بەختیار دڵنیام بە بینینی تۆ ئەگەشێنەوە چونکە منیان زۆر خۆشئەویست و ئومێدەوارم لە دوای من ئەو خۆشەویستییەیان بمێنێت.
هاتوچۆت لەگەڵ خەڵکی ناودێ پتەوتر بکە ..............................

.............................. .

هەروەها زووزوو سەر لە کەریمی حاجی بدە هەروەها فخرالدینی کوڕی کوێخا عەلی قازان و مامۆستا جلال کە لەتەڕمار مامۆستا بوو وە مامۆستا حمید نجیب و قادری سۆفی مەنیجی زێوێ و ئەوانەی منیان

خۆشویستووە لە چەرمەگا و سوسێ و حاجیتان و قەرەچەتان و قایکەند و قازیاوا. سڵاوی منیان لێ بێت هەتا هەتایە، وەک ئەم جارەش یادیان بە خێر و تۆش بە خێر شادبیت.

زیندانی موصل / بەشی لە سێدارەدان
برات ٩/٧/ ٩٧٩
حسین مولود احمد

## نامەی شەهید مەلا عەلی بۆ (ئەحمەد مەولود)ی برای

برام هەموو کاتت شاد بێ

ڕێبازی منت لە یاد بێ

برای خۆشەویستم پێشەکی سڵاوێکی گەرمت لێ بێت لە تۆ و هەموو هاوڕێ یانت  بە تایبەتی سەردار و نهاد.

چاوەکەم مردن ئەو شتە ترسناکە نی یە کە (توقع)مان دەکرد هەروەها مەسەلەی (عقیدە) شتێک نیە بگۆڕێت. زەق زەق لە پەتەکە ورد بیتەوە هێشتا پتر سور ئەبی لەسەر بیروباوەرەکەت ئەگەر ئەو بیروباوەرە (الحاد)یش بێت.

من زۆرتر لە مارکسیزم گەیشتم کە بەچاوی خۆم ئەو هەموو بێ تاوانەم دین هاتنە بەردەم پەتی خنکاندن. وەسیەتم ئەوەیە باشتر هەوڵ بدەی بۆ فێربونی مارکسیزم. هەتا مردنی یەکێکی وەکو من لەلات ئاسایی بێت. مردن لە ڕوی فەسلەجی یەوە هەر مردنە بەڵام کاریگەریەکەی جیاوازە. من لە کوڕی خەڵک زیاتر نەبووم و دایک و باوکم لە دایک و باوکی شەهیدان زیاتر نین،ماڵی احمد روستم و شێخ جلال و شێخ نوری و سەدان و هەزاران دایک و باوکی تر بە نمونە بهێننە بەرچاوتان.

چۆنیەتی گیرانم لە کەس و کارمان بپرسن هەوڵ بدە بە خەڵکی ڕابگەیەنیت و بزانە من ئەو ترسنۆکە نەبووم بە زیندویی بگیرێم، بەڵام ڕیکەوت صدفە هیچی لەگەڵ ناکرێت. مارکسیزمیش باوەڕی بە صدفە هەیە. ئەو شیعرانەی کە ناردومنەوە بیان پارێزە و شیعرەکەی (بە خێوتان کردم) بە خەتێکی جوان بنوسنەوە و بیگرنە شوشە لەگەڵ ڕەسمەکەم هەڵی واسن.

گەردنی هەموو کەس ئازاد بیت بێجگە لە (.........)، نەسرین بە ئارەزووی خۆی بدەن بە شو، بە هۆی منەوە زۆر داواکاری مەکەن لە لێپرسراوان، یا تۆمەتتان بۆ دروست نەکەن.

زوو زوو شەمال ببینن یان ئازاد.

ئیتر خۆشیت

حسین

## نامەی شەهید مەلا عەلی بۆ (ئەحمەد مەولود)ی برای

برا شیرینەکەم ئەحمەد

لە ژووری خنکاندنەوە سڵاوی دەرونی بە کوڵت پێشکەش بێت هیوادارم لە خۆشیدا بیت.

برا گیان من لە پێناوی ئازادی گەلدا بووم بە قوربانی .. ئا لەم کاتەشدا سەردار و محمد و نهادم لە بیرە وەسیەتم ئەوەیە هەمیشە سەریان لێ بدەی لە ماڵی محمد و سەردار. هەروەها هاورێیەکم هەیە لە ژووری خنکاندنە و ئومێدی بە دەرچوون هەیە ئەبێ هەمیشە سەری لێ بدەی ناوی (غازی فازل)ە و خەڵکی سەنگەسەرە بۆ ئەوەی بە چاوپێکەوتنی تۆ منی بیر بێتەوە ئومێدەوارم منی لە یادبێت.

براگیان هەرگیز لە دایک و باوکم جیا نەبیتەوە و براکانم پێبگەیەنە.

سڵاو و ریزم هەیە بۆ هەموو هاورێیان و بۆ هەموو خزمان گەورە و بچووک پێی ناوێ خەفەتم بۆ بخۆن مردن ڕیگای هەموو کەسە.

ناوی شۆڕشگێرانە بۆ منداڵەکانتان دابنێن. ئەو نوسینانەی بەجێ ماون بۆم چاپ بکەن بەتایبەتی شیعرەکان.

گەردنی هەموو کەس ئازاد بێت

لە شەوی ٢٢ لەسەر ٧/٢٣ کە ئەمشەو ماڵئاوایی یەکجاری ئەکەین لەگەڵ ئەلوەند عمر و علی حاجی حسین

ئیتر خۆشیتان

برات حسین ٩٧٩/٧/٢٢

## نامەی شەهید مەلا عەلی بۆ کەس و کاری

دایک و باوکی شیرینم، برا و خوشک و برازن و مام و ئامۆزا و ئامۆژن و خاڵ و خاڵۆژن و خاڵۆزا و پور و پورزا و هەموو خزم و کەس. گەردنتان ئازاد بێت. دوعاخوازی یەکجاری تکام ئەوەیە بۆم سەغلەت مەبن وە هەرگیز نەڵێن لە پێناوی هیچدا ڕۆیشت. دەمەوێ هەمیشە بڵێن کوڕی خۆمان بەخشی بە چەوساوەی کوردستان، لەگەڵ پێشمەرگەدا ڕووخۆش بن و ئامانەتەکانیان بدەنەوە.

ئیتر خۆشیتان
کوڕی خۆتان حسێن
٩٧٩/٧/٢٢

باوک و دایکی شیرینم، برا و خوشک

و برازایە و مام و ئامۆزا و ئامۆژنە و

خاڵ و خاڵۆژنە و خاڵۆزا و پور و پورزا

هەموو خزم و کەس و کار، لە دەستتان

ئازاد بێت. دوعا خوازی بەکارە

تکام ئەوەیە بێجم ـــ نلەت حەبە

وە هەرگیز نەتلێیە لەپێناوی هیچ دا

ڕۆیشتم. دەحەوێ هەمیشە بڵێن

کوڕی خۆمان بەخشی بە چیا و دۆڵی

کوردستانمان. لەگەڵ پێشمەرگەدا

بەدەم خۆشی بە وتاماننەتەوە بیانم

ببەنەوە.

ئیتر خۆشتانم

کوڕی خۆتانم

٢٢ / ٦ / ٦٧٩

## نامەی شەهید مەلا عەلی بۆ کەس و کاری لە چاوەڕوانی خنکاندندا

بسم الله الرحمن رحیم

خزمان براکانم دایک و خوشکەکەنم باوکەگیان داواکارم لە یەزدانی مەزن کەوا خوا سەبووریت بدا.

باوکە گیان :- زۆر بە داخەوە کەوا لە سەرە مەرگدا نەمبینیت کەوا ڕیشە سپیە پڕ غەمەکەت ماچ بکەم، برایانم تکام وایە کە گوێ ڕایەڵی قسەی دایک و خاڵ و مام و باوکم بن وە لە قسەی باوکم دەرنەچن بە هیچ جۆرێک.

هاوڕێی ئازیزم غازی فازل دێت بۆ لاتان هەروا بزانن من هاتوومەتەوە ئیتر بە خواتان ئەسپێرم

حسین مولود
ژووری سێدارەدانی موصل
بەشی خنکاندن
شەوی ٢٢ لەسەر ١٩٧٩/٧/٢٣
کاتژمێر ١١:١٥
چاوەڕێی خنکاندنم

## ڕێزگرتن لە شەهیدان

کۆڕەک
بۆ هاوڕێ ی تێکۆشەر نشوان
سلاوێکی گەرمی تێکۆشان

دوو ڕاپۆرتی ئاستی ڕۆشنبیریتان گەیشتە کەرتەکەمان کە دەربارەی
١-مەرجەکانی حزبی پرۆلیتار لە دەوڵەتی سوشیالستی دا
٢-ریڤیژنستی ئەم سەردەمە چۆن خۆی دەنوێنێ
بێگومان دوای خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە بە گوێرەی توانا گەشتینە ئەو ئامانجامەی کە ئەو دوو باسە تا ڕادەیەک لەسەر یەک بابەت یەک دەگرنەوە ئەویش مەسەلەی ناکۆکی نێوان پرۆلیتار و بورژوازیەتە کە چارەسەری تەنها بە شۆڕش دەکرێت کە توی تێکۆشەریش سەبارەت بەو باسە بۆچونەکانت راست و ڕەوایە و هەڵوێست و شیکردنەوەکانت لە چوارچێوەی ڕێبازی کۆمەڵەدا خۆی دەنوێنێ کە جێگای ڕەزامەندیمانە چونکە لەو ڕوانگەیەوەیە کە هەنگاو بەرەو یەکیەتی بیروکارکردن دەنێن و ئامانجەکانی چەوساوەکانی کوردستان بە دەست ئەهێنن.

هاوڕێ ی تێکۆشەر مەسەالەی سۆشیالستی نەک تەنها لای کرێکاران و زەحمەتکێشان باوەڕی پێهێنراوە و بە باڵاترین ڕێگای سەرفرازی لە قەڵەم دراوە

بۆ مرۆڤایەتی، بەڵکو تەنانەت لە لایەن چینە چەوسێنەر و بورژوازیەکانیشەوە باوەڕیان پێ هێناوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی و دەستکەوتەکانی خۆیان لە دەست نەچێت ناتوانن لە جەوهەردا پەیرەوی سۆشیالیستی بکەن، وشەی سۆشیالیستی وەک بنێشتێک ئەجوونەوە و خۆیان پێ وە با ئەدەن بە نیازی خەڵەتاندن و لە خشتەبردنی چینە چەوساوە و ژێر دەستەکان کە بەختیاری خۆیان لەسەر رەنجی هێز و بازووی پرۆلیتار بە دەستدێنن. هەموو پارتێک تەنها ئەتوانێ نوێنەری چینێکی دیاری کراو بێت لەسەر بنچینەی باری ئابوری خۆی، ئیتر هیچ پارتێک ناتوانێ ببێتە دەم راست و نوێنەری هەموو چینەکانی کۆمەڵ، ئەگەر واش خۆی لە قەڵەم بدا مانای وایە کە بوونی ناکۆکی (رەفز) دەکات، ناکۆکیش دیاردەیەکی سروشتیە لە ناو کۆمەڵدا لە ئەنجامی جیاوازی سروشتیی

چینەکانەوە دروست بووە، ناکۆکیش لە نێوان دوو چینە سەرەکییەکەی (برولیتار و بورژواز) لەهەر کۆمەلگایەک دا بێت ناکۆکیەکی دوژمنانەیە و ئەبێت لە رێگای شۆرش و توند و تیژیەوە چارەسەر بکرێت، لەبەر ئەوە پەیرەوی کردنی ئاشتی چینایەتی لە لایەن هەر پارتێکی پرۆلیتارەوە بێت تاوانە و لادانە (تحریف). لینین ئەلێ: دیموکراسی بۆرژوازی دیموکراسیەتی تەسک و سەرکوێرکەرە وە بریتیە لە بەهەشتی دەولەمەندەکان و خەلەتاندنی هەژارەکان. دیموکراسی بۆرژوازی بریتیە لە داپۆشینی زولم و دیلێتی بە پەچەی سەربەستی.

رژێمی بورژوازی با رێگای پارت و رێکخراوەکانی تریش بدات و شێوەی پرلمانی پەیرەو بکات بەلام تا سنورێکی کەمە، کاتێک دەسەلات و بەرژەوەندی کەوتە مەترسیەوە ئەوپەری پەنا ئەباتە بەر فاشیەت بۆ سەرکوتکردنی هەموو

پارت و ڕێکخراوەکانی تر ...

ئیتر بە هیوای کارکردن و زیاتر خۆ پەروەردە کردن بەرەو ئامانجە پیرۆزەکانمان.

کەرتی شەهید ملا علی

١٩٨١/٦/٩

---

گرنگیدانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە ڕێکخستن و پێشمەرگەکانی و لە دوای شەهید بوونیان، بۆ بەرز ڕاگرتنی ناوەکانیان کۆمیتە و کەرتەکانیان بە ناوەوە ناو ناون.

ووشەی سۆسیالیزم وەک پێشکە لێ چوونەوە و خۆیانی پێ وەبانگەوە
بە نیازی خەڵک خەڵەتاندن و لە خشتە بردنی چینە چەوساوەو ژێردەستە
کانی کە بە هیواداری خۆیان لە سەر ڕێگەی هێزو بازووی پرۆلیتاریا بە دەست
دێنن . هەموو پارتیلە تەنیا ئەتوانێ نوێنەری چینێکی دیاری کراو بێت
لە سەر بنچینەی بیروباوەڕی خۆی ، ئیتر هیچ پارتیلە ناتوانێ ببێتە نوێنە
راستەقینەی نوێنەری هەموو چینەکانی کۆمەڵ ، ئەگەر وا بێ خۆی لە خۆیدا
مانای وایە کە بوونی ناکۆکی (ڕەفض) دەکات ، ناکۆکیش دیاردەیەکی سروشتی
لە ناو کۆمەڵ دا لە ئەنجامی جیاوازی سروشتیەی چینەکانەوە دروست
ناکۆکیش لە نێوان دوو چینە سەرەکیەکەی (پرۆلیتاریا و بورژوازی) هەر کۆمە
ڵگایەک دا بێت ناکۆکیەکی دوژمنانەیە و ئەبێت لە ڕێگای شۆڕشی
تووندوتیژییەوە چارەسەر بکرێت ، لە بەر ئەوە بێ بڕوا کردنی کاشتی
چینایەتی لە لایەن هەر پارتێکی پرۆلیتاریەوە بێت ناوانێو لادانە لە ڕێگای
لینین دانی . دیموکراسی بۆرژوازی دیموکراسیەتی ئەسڵ دەسەرکوتکردنی
هەر بیرێکە لە بەرهەڵستی دەوڵەمەندەکان و خەڵەتاندنی هەژارەکان .
دیموکراسی بۆرژوازی بیرێکیە لە داپۆشینی زوڵم و دژایەتی بە بەخێو
سەرپەرشتی .
ڕژێمی بۆرژوازی بارزانی پارتی و ڕێکخراوەکانی ترشی بیرات و ستەمی
بەرهەمی بە پیرۆزکات بەڵام کاسۆزتێکی کردە ، کاتێک دەستەڵات
بگرێتە دەست ئەوسا دیموکراتیەت بە ناوەڕۆکی فاشیەت بۆ
سەرکوت کردنی هەموو پارت و ڕێکخراوەکانی تر ...
ئیتر بە هیوای کاتێکدا و زیاتر خۆ بە ڕووبەڕوو کردنەوە بەرەو
ئامانجە پیرۆزەکانمان .
کەریم شەهید مەلا عەلی
١٩٨١/٦/٩

# ١

## بۆ برای زیندانیم(١)

برای زیندانیی دووره دیدارم
ئاخ بۆ بینینت دڵ پڕ جەغارم
تۆ لە زیندانا بێ ئاگای لە من
تۆی لە من دوور کرد خوێن خۆری دوژمن
خۆزگە پاش مردن بمدیبایەوە
تۆڵەی ئەم دووریەم بکردایەوە
بە شێوە و رەفتار هەر لە یەک ئەچووین
هەروەک گیانێک بووین لە دوو لەشدا بووین
نازانم دوای من چی بەسەر تۆ دێ!

دێتە بەرچاوت یادکاری دێ
دڵت دێتە جۆش وەکو من، چۆن بووم
کە لەدووری تۆ لە هۆش خۆم ئەچووم!
چەند جارێ (ئاسۆ)[۲]م ماچ کرد لە جیاتیت
لە ڕوویا دیار بوو نیشانەی ماتیت..
(شیرین، شنۆ گیان، ڕوحەکەم ئاسۆ)
سڵاو بۆ خزمان بۆ هەمووان بۆ تۆ
من بە قوربانی باب و باپیرت،
پێشمەرگە بە تا حەڵاڵ بێ شیرت

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە
تەمووزی ١٩٧٩

هاتەوە یادم شەوێکی قەندیل
هێنایە گریان دڵەی مات و دیل
ئەو دەستەی لەوێ بەفراو ئەیتەزاند
داخ کراوە لێرە بە ئاگر و ژیل

بە دەم ڕێگاوە بە نوکتە بازی
پیشانمان ئەدا وەزعی نارازی
نەمان ئەزانی، چۆن ئەبڕێ وازوو
ڕێ ی دووری بەرەو لوتکەی هەورازی

سەرما و هەورازی قەندیل پیرۆز بێ
هەموو ئومێدتان هەر بە نەورۆز بێ
فەرامۆش ئەبێ ئەو کاتە هەرچی
ڕۆژێکی زستان سەخت و ئالۆز بێ

قەندیل، کوێستانی دڵگیری وڵات
هەر هەتاکو-ئاب داڵدەتان ئەدات
ئیتر دەواری داڵدە نامێنێ و،
تارای زیوینی نوێ ئەکرێ خەڵات

دوایش جریوە و بەفراوی بەهار
ئەسڕێ لە دڵان خەمی ڕۆژگار
ئەدڕێ لە بەریا بەرگی وەرزی کۆن
ئەیگۆڕێتەوە بە شاڵی گوڵدار!

چەندەش ماندوو بن ئەحەسێنەوە
مادام بە ئازاد سەرئەنێنەوە
مادام بە ویست و ئارەزووی خۆتان
دەستتان بە چەکی تۆڵە سێنەوە

خۆزگە منیش هەر لەوێ مابایەم
چەکەکەم بەس بوو لە جێ ی سەرمایەم
ڕانابرێ تەمەن لەم گەرمە سێرە
چونکە پەروەردەی ئەو جێ سەرمایەم

هاتەوە یادم شەوێکی - سارا-(٣)
لە نێو کەژاوەی وەرزی بەهارا
چیمەن ڕاخەر و. ئاسمانی شینی
پڕ لە ئەستێرەش، دەسماڵ و تارا

وەک ڕازانەوەی ئاڵ و واڵای بووک
لەناو ئامێزیا لەشم ئەبوو سووک
چۆن بەسەر بووکا نوقڵ ئەباری
بە ئێمەش ئەبڕا نوقڵی بەڵالوک

کانی بەفراوی پڕ لە زیخ و چەو
ئەفسوونی ئەرشت لەبەر مانگە شەو
خشەی دار مازووی بەر شنەی فێنک
چپەی دوانی بوو لە جێ ژوانی ئەو

جریوەی مەلی لانە لێ وون بوو
شمشاڵی شوانی شیعری (هێمن) بوو
داری جێ لانەی شەوی رابووردووی
بێ لانەیەکی تری لە بن بوو

شەو ئێشکچی بووم لەگەڵ هاورێ یەک
لە شوێنێکی بەرز لە بن هەرمێ یەک
خەیاڵی خاویش، خولیا و خەریکی-
گەرانی خۆی بوو، بۆ هەموو جێ یەک

جارێک پەپوولە و، جارێکیش مەل بوو
جارێک پشت کۆم و دەست کۆڵ و شەل بوو
جارێک فیشەکی ناو لوولەی چەکی
پارتیزانێک بوو، چاوەڕێ ی هەل بوو

جارێک بە هەوای هەناسە ئەبزووت
جارێک جێ گرتوو وەک کێوی- برزووت(٤)
جارێک سەهۆڵی چۆڕاوگەی دۆڵی
کوێستان و، جارێک پشکۆی سەرە بزووت

هێندە خێرا بووماڵی نەشێوێ
ئەو ناوە گەڕا هەتا پارشێوێ
وەکو تەتەرێک (ئۆرگان)ی پێ بێ
لە قەندیلەوە بۆ — سارا — و — زێوێ — (٥)

جارێک بە پیادە و، جارێک بە سواری
ڕێ ی سەرەو ژوورو، ڕێ ی بەرەو خواری
ئالان و پشدەر — ئەگەڕاو هەموو
کۆمی چەم و زێ ببونە بواری

ئەو ریزە شاخە تا – پیرەمەگرون–
کە پێستی سەری داگیرکەر ئەگرون
پێیان لە شەختەی سەهۆڵ ئەترازێ و
لاشەیان ئەبێ هەپرون بە هەپرون

بۆ کەشتی خەیاڵ ببوونە بەندەر
بۆ کەشتی ساڵێک لێ ی ئەخست لەنگەر
جارێک ئەبوونە جێ هەواری خێڵ
جارێک ئەبوونە بنکە و جێ ی سەنگەر

جارێک خەیاڵی هەتیوی بێ کراس
یان پێ تەزیوی، مل رووتی- پێ خواس
جارێک خەیاڵی باوەشێنی دڵ
بونە هەوێنی راز و باس و خواس

دوور و نزیک و، (ئاسمان و رێسمان)
بوونە تان و پۆی پەخشانی باسمان
مانگ و ئەستێرە ئەرژانە ئاوی-
دوکان- و، ماسی ئەچوونە ئاسمان

بە ڕووی – دوکان– و، بە ڕووی – سورداشا–
لەو جێ بەرزەوە ئەمکرد تەماشا
ئەو گەڵا سەوزەی، سایەی سەرم بوو
نەم ئەگۆڕیەوە بە تاجی پاشا...

خۆزگە ئەمردم ئەوسا لەو کێوە
چەکەکەم ئەیبرد یەکێک لە ئێوە
وا ئێستا چەک و فیشەکدانەکەم
نازانم لە کوێ، بەشانی کێوە

هاتەوە یادم شەوێکی – قۆپی –(٢)
چرا تۆری گوند و، قەرەداغ کلۆپی
بۆ سوخمەی رەشی شەو گۆبەرۆکی
زەماوەندێک بوون، قۆپی سەرچۆپی

لە زمناکۆ– وە هەتا– بەرانان–
بە رەشبەڵەک و لەنجە و خۆرانان
ئەدرەوشایەوە (لالا) و لۆکس و
کارەبای خشڵی سابات و بانان

ئەو شار و گوندو، ئەو شاخ و هەردە
لە -باسەرە- وە هەتا- گڵەزەردە-
هێمنی باڵی بەسەر کێشابوو
وەک بووکی شەرمن چووبێتە پەردە

خورەی کانیاویش لەو بەرەو خوارە
لێم بوونە خرمەی کرمەک و گوارە
لەدەستی (دۆ)دا هێندە خەیاڵم-
هەڵپەڕی، ئێستاش هەناسەم سوارە

کەڵامێو، بوونە ڕستی (لاگیرە)
لاولاویش بوونە ملوانکەی (لیرە)
ئەوەندەم لەوێ تەماشا کردن
لێرەش بابەتی زاخاوی بیرە

ئاسمان ئاوێنەی پێش کەژاوە بوو
سامالێکی بێ، هەور و ژاوە بوو
بەڵام ئاسمان و زەوی ئەندێشەم
شانۆی نواندنی سەد ئاژاوە بوو

لە دڵما تۆوی چەند بیرەوەری
سەوز بوو، گوڵی کردو، هەڵوەری
دیسان بۆ وەرزی تازە تۆوی ڕشت
تا، بێ گوڵ نەبێ بۆ کوێرەوەری

لەو جێ ڕەشماڵ و، هۆبەو هەوارە
لووت بە بۆن کەوت و، چاو بە شەوارە
بۆیە تائێستاش ناتوانم باسی
تەواو بنووسم، دەست کۆڵەوارە

تاوێ گوێم ئەگرت لە رادیۆی ئێران
-ئێرانی ئێستا- ئاڵۆزی، وێران
تاوێ بەستەیەک لەسەر لێوم بوو
بە ئاستەم ئەمووت لەبەر نەوێران

ئەترسام کەسێک گوێی لە دەنگم بێ
بێت و ئاوێزەی گراوی شەنگم بێ
لەو شوێنەی شەوێ شایی سروشت بوو
بەیانی لەگەڵ دوژمن جەنگم بێ

دەستی هاورێ یەک ناگاتە دەستم
خۆشم بەتەنیا نەتوانم، هەستم
بەو ئەرکە وپەکی فرمانم کەوێ
نەگاتە ئەنجام وەک خۆی: مەبەستم

خەیاڵ، کەلێ جێی ئاوا کردەوە
گرەوی لە بزەی ساوا بردەوە
چی لە مردن کەم دەرفەتم نادا
نەخشەی خەیاڵم بینە کردەوە

بەتەنیا شەوم ئاوا بردە سەر
کۆڵەکەم دانا، سەرم کردە سەر
خۆزگە ئەمردم لەوێ تا بۆتان
نەبوومایە هۆی ئێش و دەردی سەر

لەوێ ئەمردم، ئەنێژرام و بەس
ئیتر نەدەهات بۆ دیدەنیم کەس
باوک و دایکی (خۆشی نەچێشتوو)
وانەدەبوونە خەڵوز و قەقنەس

ئێستا کەوتومە ئەم شوێنە تەنگە
ڕاخەرم خارو سەرینم سەنگە
پەی، بە ڕۆژگاری ئاینده نابەم
ئەپرسم، ئەژیم؟ کەس ناڵی ڕەنگە

ئەمرۆ لێرەم و سبەی لە گۆڕێ
چش با ناویشم نەیەتە گۆڕێ
من بەڵێنی خۆم هەر ئەبەمە سەر
ڕێبازم لەناو گۆڕیش نەگۆڕێ

قەندیل – وسارا– و قۆپی– ڕەنگینم
سامان وتاج و تەخت و نگینم
بۆ سەربەخۆیی گەل بوو، خەبات و
لەگەڵ ئارەزووی خۆما جەنگینم

گەرچی وەک ماسی دەریا لە تۆرا
دیار نیم لە هیچ کەس مەگەر لە تۆ،را
بەڵام ئاسوودەی ئەوەم، باوەڕم
بەسەد ئەشکەنجە و، تەفرە نەدۆرا

من ئەڕۆم و تا ئێوەش بمێنن
هەزاری وەک من دەستە و دامێنن
ببنە سەربازی سەر لە پێناوتان
بێ ئەوەی بۆ گیان بەخشین دامێنن

**زیندانی موسڵ**
**بەشی سێدارە**
**١٩٧٩/٦/٨**

# ژیان (٣)

ژینم وەک خەوێ هاتە پێش چاوی
کوردستان تێر تێر نەژیام لە ناوی
نەژیام خزمەتێ بکەم هەتا هەم
تێشوی بۆ شۆڕش تیا بێنمە بەرهەم
نەژیام تا درکێک وەلا نێم لە رێ ی
هاورێ ی پێشمەرگەم زامار نەبێ پێ ی
نەژیام خزمەتێک بۆ گەل تۆمار کەم
رووم بێ! روو بەرەو ئالای کرێکار کەم
نەژیام هێند بکەم پێشمەرگایەتی

برا شەرم ئەکا: بڵێن: برایەتی
ئەژیام ئەو کەسەی وەک منەو، دیلە
ئازاد بێ و بڵێ: برام لە قەندیلە
ئەچمە دیدەنی لەو جێ هەوارە
کە بنکەی سووری هیوای هەژارە
کە زانکۆی شەڕی پێشمەرگانەیە
ڕمی ئاراستەی ڕووی بێگانەیە
ئەژیام بێتەوە، بچمە سەردانی
پێکەوە بچینە نێو ئاوەدانی

کۆڕی گفتوگۆی هەر وەکو جاران
ببەستین لەگەڵ خەڵکی، ئێواران
بەتێری باسی ئەم زوڵم و زۆرە
شی بکەینەوە بۆیان بە نۆرە
نەژیام کۆرپەیەک ناو بنێم – تۆڵە–(۷)
بڕواتە شوێنم با نەڵێن: چۆڵە
نەژیام برازایەک، ناوبنێم ژیلوان(۸)
تا نەڵێن، گەردوون بۆ پیاو کوژی لوان
برازا تەمێ کا بە مەرگی مامی

ئاو ئەدا بە خوێن ڕەگی نەمامی

نەژیام بۆ خەڵکی بیمە جێ ی بڕوا،

نەڵێن بێ سوود بوو، چش-- دەبا بڕوا

نەژیام بۆ نەوەی نوێ، ڕێ تەخت کەم

نەک جارێ سەد جار گیانم بەخت کەم

نەژیم بۆ مردن، بمرم پیاوانە

مەرگم ببێتە یەک دەریا، وانە

نەژیام تا نەوەی تازە ببینم

بۆیان هەڵڕێژم، چی تیایە.ببینم

تا هەموو هەستی پەنگ خواردوی دەروون
دەربرم و، بانگم بکاتە گەردوون
بیدا لە ژێ ی گوێ ی هەموو جەماوەر
پارتیزانانە، ببنە جەنگاوەر..
خەباتی سەختی — کۆمەڵە— و کەڵکی
ببێتە ئەزموون بۆ هەموو خەڵکی
هەر لە خۆرهەڵات، هەتا خۆرئاوا
بڵێن نموونەی کادری ئاوا،
کەم و پوختە بێ، نەک بۆرو، گەلێک بێ

لەگەڵ کاروانی هەرچی گەلێک بێ
ئەشێ بکرێتە سەر مەشقی خەبات
هۆی رزگاری بێ، بۆ گەل و وڵات
نەژیام بەو ئەرکەی سەرشانم هەستم
بێتە دی هەموو خۆزگە و مەبەستم
بۆ هێنانە دی ئەوانە ئەمرم
بۆیە داوێنی کوردستان ئەگرم:
بمخاتە ریزی مەردانی ئازا
ئارەزووم وا بوو، بەڵام نەسازا

ئەم ویست خزمەتی وولات پیشەم بێ
ئاڵای سوور بووکی نوێ ی هەمیشەم بێ
چی بکەم.. نەخشەکەم مردن تێکی دا
دوژمن خوێنەکەم وا لە پێکی دا
بەڵێ پێ ی وایە لەناوم ئەبا
نازانێ بەرەو هەتاوم ئەبا
بەرەو خۆر، بازووم پێ هەڵ ئەماڵێ
ئەبمە رووناکی بۆ هەموو ماڵێ
چەند ڕۆژێکی تر بەرەو سێدارە

ئەبڕێم و ئەمرم، گیانیش بێدارە
بۆیە کە دوژمن لێم ببێ بە دێو
پاڕانەوەم لێ ی نایەتە سەر لێو
زامی ئەشکەنجە و، بەند و کۆت و پەت
سەرم بۆ دوژمن نەوی ناکا قەت
مەردانە پێکی مردن ئەکەم نۆش
چش لە من، سەری هاوڕێیانم خۆش
بەڵام کە ئەمویست نەمرم بە گەنجی
کوردستان ئەیوت، پێویستمە ڕەنجی

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە
١٩٧٩/٧/١٥

# ٤

## بۆ ئازیزەکەم (٤)

کە ڕێیان داوی بۆ یەک جار
توخوا ئازیز
دیدەنیم کە
چەند ڕۆژێکم وەرزی بەهار
ماوە، (بێ وادە) هات پایز
خەزەڵوەرە
توخوا وەرە..
دیدەنیم کە:
با وا تێ نەگەن کە دەردی

سوورە گوڵی

گەشی دوێنێی–

سەردوا چڵی

ئەمڕۆ لەبەر زریان زەردی–

بەرەو مەرگ چوونە ئەمگا زیز... تۆ خەنیم کە

ئازیز گیان... ئەگەر تۆ ڕازیت

خوێنم ئەرێژمە دێراوی

بە ڕێحانە و گوڵ چێنراوی

دەورو بەری ڕێ ی پێشوازیت

ئازیز گیان.. کە ئارەزووت
بۆ کام گوڵەی زۆر جوانە، بزووت
کە مەیلی دڵ
شوێنێکی کردە باخی گوڵ
ئێسقانم ئەکەم بە – کود– و
بە دێراوی گوڵشەنیم کە
توخوا ئازیز وا هاورێیان
بۆ سەرەی مەرگ هاتن بە ڕیز
هەر منیان لێ بەجێ ماوم

هەتا ماوم،
بفەرموو، جێتە سەرچاوم
لە ڕێ ی هاتنت وەستاوم
دیدەنێم کە
گەر ئەفەرمووی... خوێنم هەمووی
گوڵزاری ڕێتە، موو بە مووی
ئەبمە قوربانی لە پێشت
بۆ تێ هەڵسوونی بەر پێشت
خاوەن گلێنەی دیدەنێم، کە:

تا ئەمرم لە ژوور سەرم بی
بۆ دلداری رابەرم بی، ریێ نوێنیم کە...
توخوا ئازیز، خۆ ئەزانی چۆنە شوێنم(٩)
ئەزانی بێ بەرگ و نوێنم..
بێچارەم و، بەشەرمەوە، تۆ ئەدوێنم
بێ ی بۆ بژاری پووش و خاری
نێو گولزاری زامی خوێناوی دژوێنم
بە هاتنت، بارۆشن بێ دەورو بەرم
ئاخاوتنت هۆنراوە بێ، بێتە بەرم

سەرپۆشەکەت، پێش کفن بکرێتە بەرم
وەرەچارێ: شەونخوونی و، رۆژ خەواڵووی
بێ نوێنیم کە
ئازیز گیان تۆ بێ و گوڵی رووت
بە پێ ی پەتی...
قوڵفەی پەتی
سێدارە ئەخرێتە بینم
ئەمرم و، نەبا نەتبینم
نەت بینم هەر بڵێم: خواحافیز

تۆخوا ئازیز

وا دڵ ناسک نەبووم هەرگیز

دیدەنیم کە ..... !!

زیندانی موسڵ

بەشی سێدارە

١٩٧٩/٧/٢١

# ٥

## ژووری سێدارە

برا دوور و خزم دوور کەسم دوور
بە نابەڵەد تەمەن ئەمبا بەرەو ژوور
بەڵام روونە، بەرەو سێدارە چوونە
ئەنەی خوێنم لە پێ ئەگرێ : ئاڵای سوور

بەرەو ژووری، بەرەو ژووری سێدارە
ماندووی کردووم و شوێنەکەم شێدارە
کە نیشانەی پەشێوی پێوە شێوەم
ئەوە برینی ئەشکەنجەیەو، جێ دارە

ئەڵێن: ئەمرێ و، لە ترسی مردن پەشێوە

پێشمەرگە بم هەر ئەکەومە پێش ئێوە

بە مەرگی پێش مەرگی ئێوە ئاسوودەم

رووشم، زەردەی پێکەنینی هەر پێوە

گەرچی بەرەو دوامالّی ژین بەرێوەم

یەکەم ماڵی نەمردن دیارە لێوەم

بەشم چونکە مردنی ناو جێ نی یە

شادم کە تا دوا هەناسەش بە پێوەم

مەرگی ئاوا ناگۆڕمەوە بە سەد ژین
ژینێک سەرم بۆ دوژمن بێ بە پەرژین
سەربەرزی یە کە پێڵاوم ئەبینن
بەسەر سەری دوژمنەوە لە بەرزین

پێ لەسەریان دائەنێم و ئەڕوانم،
بەرەو شاری جێ هەواری کاروانم
ئەگەم پێیان، چونکە دیارە جێ پێیان
ئێرەیە و لێ ی لانادەم تا ئەتوانم

ئەوا ئێستا کەوتوومە شوێن پێشڕەوێک[١٠]
کە لێرە بوە لە پێش مندا چەند شەوێک
دیارە منیش هەر ئەوەندەی لێ ئەبم
وا بە نوێنی ئەو ئەشکێنم سەرخەوێک

خۆ بە نوێنی جێماوی دا ئەپۆشم
تا پێ ی سووک بێ، ئێشی لاشەی نەخۆشم
بۆتە بەڵگەی بە شوێن ئەودا ڕۆشتنم
ئاخۆ کێ ی تر پێ ی دێتە شوێنی خۆشم!

دیسان ڕێگای شوێنی کەم لە پێشە
ڕێ ی گۆڕستان،[11] کە دڵنیام ئەو لە وێشە
ئەگەر لاشەم نەشێ ببرێتە شوێنی
گیانم لەسەر گوڵی سەر گۆڕی مێشە

کە دڵنیام ئەچێتە جێ ی شاناری
لەو ڕێیەدا منیش ئەکەم گیانبازی
کە ئەو خوێنی خەڵاتی ڕێ ی خەباتە
خوێنی منیش ئەنەخشێنێ ڕێبازی

ئەو مەرگەی لێم ترساوە، ئەیلاوێنم
بۆ ناوێری بێت و، بگری داوێنم!
با بمناسێ کە پێشمەرگەی –کۆمەڵە– و
کادرێکی دەست و داوێن خاوێنم

کە پاش مردن هەبوو دنیایەکی نوێ
تا ئەو کاتە با گیانیشم تێر بنوێ
چونکە ڕۆژی هەستانەوە دەرفەتی
فرمانێکی وەک ئێستام هەر بۆ ئەلوێ

لەو دنیایەش هەر پێشمەرگەو، کادرم
کە هیچ نەبێ لەوەی ئێستا چاترم
لێرە خاوەن ئەزموونی ڕێ ی خەباتم
لەوێ لە نێو کوورەی شۆڕش ئاگرم

ئەگەر لێرە نەمتوانیبێ بجەنگم
لەوێ بەدەست هاوڕێیەکەوە تفەنگم
ئەگەر لێرە بەجێ مابم لە کاروان
لەوێ لە پێش کاروانەوە پێشەنگم

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە
١٩٧٩/٦/١٨

## ٦

## قوربانی (٦)

هەموو مانگی ساڵ بوونە حوزەیران[١٢]

هەموو وەرز بوون بە وەرزی خەزان

کام گەلی دنیا وەک کورد بێ بەشە

بەرگ و کاڵایان سەرتاپا ڕەشە!

هیچ ماڵێک نیە بێ قوربانی بێ،

ساتێکی ژینی شادمانی بێ

پیرو لاو هەموو لە ڕێ ی نیشتمان

بە شیان کوشتنە و لە سێدارەدان

کەوابێ بۆچی ژین لام شیرین بێ!

دڵ پڕ لە کوڵ و، چاو پڕ ئەسرین بێ
ئێستا ژینی خۆم هێند لا هەرزانە
سەد جار قوربانی ئەم کوردستانە
قوربانی چینی چەوساوەی ئەکەم
کورد بە ملیۆنی وەک من نابێ، کەم

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە
١٩٧٩/٦/٢

ئەوین و وەفاو دڵسۆزی و پەیمان
لەگەڵ خۆم ئەوا هەمووم لە گۆڕنان
چاوەڕوانیشم(١٣) زۆر بەرێ کردن
هەزاران خۆزگەم لەگەڵ خۆم مردن
لێم ون بوون شیعر و وێنە و یادگار(١٤)
وەک خۆمیان لێ هات بە دەستی ڕۆژگار
ئەوەی لە پاشی خۆم بە جێ ماون
چەند کاسێتێکی تۆمار کراون
(مامڵێ و شارۆخی و زیرەک و دیلان)

ئێستا بیستنیان مەنعە لە دیلان
وەفا داریانم ئێستاش لە زیندان،
خۆزگە لە پاش خۆم بە (ئەحمەد) ئەدران

**زیندانی موسڵ**
**بەشی سێدارە**
**١٩٧٩/٦/١٠**

## ڕاز (٨)

ئێستا ئومێدم هێندە لاوازە
ناتوانم بڵێم : دەمێنم تازە
مردووم و نانی زیندوان ئەخۆم
تازە ناتبینم، ئازیزەکەی خۆم
دوێ شەو لە خەوما، دوور بێ لە باڵات
لێت نزیک ئەبووم تا ماچ کەم گۆنات
ئەڵێن لە خەودا کەسێکی زیندوو
هەڵسێ و دانیشێ لە گەڵیا مردوو
نیشانەی سەرە مەرگی لێ دیارە
بۆیە لە مەرگت ترسام ئەمجارە

مەگەر هەر بە خەو تۆم ماچ کردبێ
دەستم بۆ سینە و مەمکت بردبێ
بە تاسەوە بووم بتگرمە باوەش،
نەمدی، وا ئەمرم، پاشی من تۆ خۆش
من تۆم لەبەر خۆم خۆش نەویستووە
کەسیش ئەم (راز)ەی لێم نەبیستووە
ئێستاش ئەم رازە کە ئەدرکێنم
ویژدانی ماتی خۆمە ئەیدوێنم

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە
١٩٧٩/٦/١٠

# بە خێوتان کردم[15]

بە خێوتان کردم هۆ: بابە و، دایە
ویژدانم لە ژێر قەرزتان دایە
وا مداری ئێوەم بۆیە لە تاوان
پێم وایە ئێیسکم ئەکرۆژێ تاوان
تاوانی ئەوەی لە پێناوی من
ڕێتان کەوتۆتە بەر ماڵی دوژمن
تاوانی ئەوەی بۆم نەلوا دەرفەت
لابەم لەسەرتان ئازاری خەفەت
قەرزی وولات و گەلم دایەوە

بەڵام هی ئێوەم لەسەر مایەوە
خاڵ و خوشکەزا، ئامۆژن و مام
خوشک و برازا، براژن و برام
دۆست و دراوسێ، برادەر و هاوڕێ
ئەوەی جارێک دیم لە دوو هەنگاو ڕێ
پورزاو، خاڵۆژن، ئامۆزام و، پور
خزم و کەس و کار، لە نزیک و دوور
ئەڕۆم پێشوازی لە مردن ئەکەم
لە ئێوەش داوای لێ بوردن ئەکەم

لە دڵ ڕەنجانی ئێوە ئەترسام
دەنا بێ سڵ بووم، لە مەرگی بەسام
ئاواتە خواز بووم لە دوای ڕۆژی ڕەش
بووکی ئازادی بگرمە باوەش..
بچمە سەر لوتکەی بەرزی حەساروێست
بانگ بدەم بە گوێ ی خزم و برا و دۆست
کەم خواست و خۆزگەم گەیشتە ئەنجام
هێشتا لە ڕۆژی هیوا نەرەنجام
هەر بە ماندوویی ماوم تا ئێستا

لە ڕێ ی چاکە بووم سوێند بە ئاوێستا
ئەوەی چاکە بوو لە ژینا کردم
هەر بە سەربەرزی ژیام و مردم
وەسیەتم وایە هەتا بمێنن
لە خۆتانەوە کەس مەرەنجێنن
پرسەم بۆ مەگرن نەکەن بۆم بگرین
مەڵێن با قوری بۆ لەسەر بگرین
گریان کردەوەی بێ دەسەڵاتە
(تورەیی شۆرش) خەندەی وڵاتە

دەرمانی دەردم ناکا شۆڕ و شین
چۆن ڕزگار ئەبین بەبێ (شۆڕ) و (ش)
لە بری بەرگی ڕەش سەرتاپا (خاکی)
لەبەر کەن هەتا نامێنێ ماکی
ئیمپریالیزم و بازرگانی جەنگ
دەرئەپەڕینن بە لوولەی تفەنگ
وولات جێ دێڵن دوژمنانی گەل
خۆری ئازادی هەڵدێ لە دەم کەل

کاتێ وولاتی لە خوێنا رەنگاو
رزگاری ئەبێ هەنگا و بە هەنگاو
زانست و بیرو پێنوس و مەچەک،
شەن و پاچ و بێڵ، چەکوش وداس و چەک
بۆ گەل بێ، پیر و منال و، گەنجی
نۆشی گیانی کات بەرهەمی رەنجی
تا ئەوسا ناوی ئێمەش ئەمێنێ
پەیکەرمان خەڵکی ی تێ رائەمێنێ
تا بە زیندوویی لەم سەر خاکە بن

وەسیەتم وایە روو لە چاکە بن
سەر ئەنجامی ژین تەنها مردنە
ئەوەی زیندوو بێ[٢]، چاکە کردنە

هيئة التحقيقية الخاصة
كركوك
١٩٧٩/٢/١

ژینم وەک خەوێ هاتە پێش چاوی
کوردستان تێر تێر نەژیام لە ناوی
پێ ی دا بگەڕێم بێ کۆسپ و سنور
بە ڕاست و چەپ دا و بەرەو خوار و ژوور
ئێستا بە خەیاڵ دێمە سەیرانی[١٦]
ئاخۆ چ ڕۆژێک دێمە سەیوانی
کامە ترۆپکەی سپی و بەرز بوو
کامە بەندەنی سەخت و سەوز بوو
کام مێرغوزاری تەڕ و پاراو بوو

کام ڕۆژ ئاسمانی شین و هەساو بوو
گەر تا هەتایەش لە پێش چاو نەبن
تاسەی سەرنجیان هەر نایەن لە بن
دەمی کۆتایی وەرزی هاوینێ
کە (گوڵە جوتێرە) سەری دەردێنی
دیسان ژینەوەی گیای وەرزی پاییز
مژدە دەخاتە دڵی پەست و زیز
تیشکی هەتاوی پاش پەڵە باران
وە ڕەنگ دەهێنێ پەل و پۆی داران

تا دەمی پاییز (کیڤار و ئەستێر)[١٧]

لە کوێستان سەوزن (سا یادیان بەخێر)

زستان ڕەهێڵە و باران و بەفر

دەسرێ تۆزی ڕێ ی ڕەشماڵ و کەپر

خۆزگە ئەخوازن گەنج بە ڕابردوو

بە چپەی دوانی ژوانی دوو بە دوو

گەنج پەکو پەکوی ڕابوردوویانە

کە نای بینینەوە ئاخ و ئۆفیانە

دێتەوە یادیان پۆلی نازداران

لە پێش تاوڵی بوون، دەمی ئێواران
چاو بە ئیشارەت، دەم بە پێکەنین
لە پەری جوانتر، هەرچەندەکەنین
ئاخ پایز وادێ وەرزی مردنە
وەرزی جودایی و پەنا بردنە
مەرگی سەوزە گیا، هی گوڵ و گوڵزار
کاتی زەرد بوونی گەڵا و گوڵی دار
بە درێژی وەرزی زستان سەرانسەر
سەد نائومێدی سەختت دێتە بەر

هەتاکو بەهار دەگەڕێتەوە
لاپەڕەیەکی یاد ئەکرێتەوە
بەهار لەشکری هەور و لێشاوی
کە پڕ لە داخە، تێکڕای هەناوی
نیشانەی زستان پاک ئەشواتەوە
پێشی تورەیی جاک ئەخواتەوە
گوڵە حاجیلە، هێرۆ، نەستەرەن
مێلاقە، شلێر، شەقایق، سەوسەن
شەوبۆ، وەنەوشە، خاتوونە، نەسرین

لە ڕەنگی ئاڵ و، سەوز و زەرد و شین
هەڵزو گیابەند و کەنێرەو کەما
بە شنەی فێنک دەکەونە سەما
لەگەڵ گیای ناسک وەکو دلداران
لەیەک دەئاڵێن هەموو بەهاران
کە پلوسکی گەورەی بەفراو ئەبینی
گەرەکتە دەمت بخەیتە بینی
لەسەر لوتکەی ڕاز دەرژێتە خوارێ
دەیکەنە گرمە و، هاژە بە جارێ

لەعل و مرواری، لەوان دەپرژێ
ئەفسوونی جوانی لەوان هەڵدەرژێ
دەبێتە بازنەی حەوت ڕەنگی بەر خۆر
دەرازێتەوە سروشت هەمە جۆر
لە دەم ئاوەڕوێ ئەو نشێوانە
جوانی بێ ڕادە و چەند و پێوانە
بەر ڕۆژ و نسێ و هەوراز و نەوی
بەرزی ئاسمان و ڕووبەری زەوی
هەستی هۆنەر و دەستی هونەرمەند

ناتوانێ دەری ببڕێ چۆن وچەند
جا وەرە سەیری پۆلی ڕەشمالان
هاتوونەتەوە جێگاکەی سالان
پیرۆز و خونچە و نەشمیل و ئەستێ
یەک مەر ئەدۆشێ یەک ڕائەوەستێ
زارا و نەسرین و بەهار و کالێ
یەک بەرە و کانی یەک بەرە و ماڵێ
کیژی چاو مەستی ئەو هەوارانەن
فریشتەی ئاشتی ئەو کۆسارانەن

شەیدای شمشاڵی سەر بەردە بێرن
هەقیانە چونکە بەو جۆرە فێرن
بەڵام هەزار ئاخ، هەزار هەزار ئاخ
ئەمساڵ کۆچەری نایەنە ئێلاخ
نابنە میوانی ئەمساڵی بنار
بێ رووناکیە بێ ئەوان بەهار
چۆڵە هەواری تەنگی (سلێمانی)
هی(دۆڵە کۆکێ و. بەردە هەسانی)
هەواری(گوێزلێ و چواس و بێ دەلان[١٨]

گەوەرە،زەڵێ، تۆژەڵە، قۆرغان)
هەموویان چۆڵن وێران کراون
بەزۆر بۆ دەشتی گەرمێن براون
ئاخ بۆ وولاتمان لێ دەشێوێنن؟
دێهات و باغمان بۆ دەسووتێنن!
وەدەرمان دەنێن لە خاکی خۆمان
ئێمەش وەسیەتەو، جێماوە بۆمان
کە سەر شۆر نەکەین لە ئاست داگیرکەر
ڕۆژێک دێ شەبەق دەیان کەینە دەر

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە
١٩٧٩/٦/٢٢

دەڵێ ی: لێم گەڕێ[١٩] تاوێ بسرەوم!

ماندووم، دەمەوێ کەمێک بخەوم!

بنوو خۆت باوێ ناو گێژی خەیاڵ

وەک چۆلەکەیەک بفڕە یاڵە و یاڵ

چی بەسەرهاتە بێتەوە بیرت

تا چاو دەبینێ و بڕ دەکا شیرت

تا دڵ حەز دەکا و دێ بە دەستەوە

خۆت بدە بە دەم هەودای هەستەوە

بەشوێن پەپوولەی باڵ بریقەداری

ووشەدا بڕۆ هەتا بێداری
بە شوێن هەلالەی کوڵی ناسک دا
تەنانەت بە شوێن ڕەوی ئاسکدا
بە ووشەی جوان و تەعبیری بە تین
ڕستە داڕێژە، پاراو و شیرین
بە کێش و سەروا، دەسا ڕۆمانێ
هەر لەو خەیاڵەی دەیکەی، بۆم دانێ
تا لەبەری کەم وەکو فەرزی نوێژ
دەروونم پڕ بێ و بکا سەرە ڕێژ

چیت بە چاو دیوە لە ناوچەی (پشدەر)
کەناو، بێگەلاس، هەڵشۆ، سەنگەسەر
هێرۆ، باوژێ، بێشێر، بەستەستێن
ژاراوە، رەزگە، هەتا شارستێن
لەگەڵ خەیاڵم ئاوێزەن گیانە،
بیانکە ملوانکە، وەکو زەنگیانە
بیکاتە گەردن بەژن شۆڕەکەم
رۆژی هاتنی بۆ سەر گۆڕەکەم
کام گوندەی ئەڵێ ی، بەهەشت بوو بۆ خۆی

ئەوەی کە باشتر باسیان بکا، تۆی
چونکە پێت ووتم زۆر لێ ی گەڕاوم
ئێستاش وێنەیان دێنە بەرچاوم
چوومە شوێنەکەی بیرەوەری تۆ
ئاوەکە و مرەو بێناسەو هەڵشۆ
ئەو رۆژەی ڕێمان کەوتە- بێناسە-
ئەو ناسکە پەنجەی ئەتووت ڕێواسە
چای خستە بەردەم ئێوە لە پێشا
تا پێتان زانی دەستم بۆ کێشا

نان و هەنگوین و، دۆی ساردو، کەرە
خەیار و ترۆزی و، میوەی نۆبەرە
لەگەڵ نیو نیگای کیژی کەڵەکەت
ووزەیان خستە نێو لاشەی شەکەت
مێخەک و جاترەو، ڕێحانە و، سێپەر
وەک بۆ ئێمەیان خستبنە سێبەر
هەنگی سەرنجی من و مێشی هەنگ
هەنگ بۆ هەڵاڵە و، من بۆ کچی شەنگ
ئەو لە دێبەر بوو، لەبەر هەتاو

من لە سێبەریش سووتام لە تاوا
(وەسوێنەو، گیپرەو، بادین و، بێ موش)[٢٠]
لێ ی تێکەڵ ئەبێ پاییز تەڕ و پووش
پاییزی ئێستا، بەهاری دوێنێ
خەیاڵی بەرەو گۆڕە ئەمدوێنێ
هێرۆ–شم دیوە، باڵێلان، بەکاو
مرێ، دەرونە، گوندی نزیک ئاو
یادی ئێوارەی – مرێ– و – دەرروونە–
ئێستاش ئاوازی ناڵەی دەرروونە

لە بیرتە – کاڵێ– و – ئاریز– و –پەخشان–
لە ڕێ ی کانی بوون گۆزە لەسەر شان
بۆ چاک و خۆشی ئێوە دەهاتن
ئەتووت شیرینی شەوی بەراتن
(..........) داوای تۆزێ ئاوی کرد
–گەلاوێژ– دەستی بۆ سەر چاوی برد
پاشان ئاویشی هێنا بۆ ئێمە
دیاری ئەو ڕۆژەی تا ئێستا پێمە
ئێستا تینوومە و ووشکە دەروونم

چاوەڕێ ی ئاوی دەستی خاتوونم
بیری (مرواری و ئامین و، گەوهەر)
خەندەیان ڕەی ڕەنگی گوێمە، هەر
لە یادم ناچن تەنانەت لیرە،
باسم بۆ ناکرێن لەم گەرمە سێرە
هەر تەنیا جارێک چوومە(لبانە)(۲۱)
رووم کردە دەشتی پشدەر لەو بانە
مەگەر دێهاتی-ئالان- وەها بن
ئێستا وێران بوون، حەیف و مەخابن

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە

کوردستانەکەم، کوردستانەکەم
بووکی یەک شەوە و دەسگیرانەکەم
رووت وەکو کەزی و پرچی ئاڵۆزە
بە چنگی خەبات با بۆت شانەکەم

وێردی زمان و قبیلەگای منی
جوانتر لە نیگای کیژی شەرمنی
ئەوەی جێ ی داخە لێت بێ بەش ئەبم
نابینم بڵێن شکا دوژمنی

ناشبینم کە کورد وەکو میللەتان
ئاڵای سەربەستی هەڵکا لە جیهان
ناکۆکی نێوان چینان نەمێنێ
وەک یەکی لێ بێ لادێ و شارستان

دەنا دڵنیام دوژمنی بەشەر
ڕۆژی دێ ماکی لە بن بێتە دەر
خۆش گوزەرانی و زانست و جوانی
بەرگی بوکێنی ی وڵات بێ تا سەر

ئەی کوردستانی بێ داڵدە و پەنا
نەمامی ژینی منیش هەڵکەنا
چاو بە فرمێسکی ژێر دەستەیی تۆم
هێندە دەربەستی خۆم نایەم دەنا

ئەی کوردستانی مەڵبەندی کاوە
جێ ی داخە نەمدی ئاڵای شەکاوە
بەڵام ڕۆژێک دێ هێزی نەوەی نوێ
کۆشکی زۆرداری پێ هەڵتەکاوە!

زیندانی موسڵ
بەشی سێدارە
١٩٢٩/٦/٨

# ١٣

## دەزگیرانم

دەزگیرانی بە جێماوی ژوانی چۆڵم

بەنەشتەری

بیری نائازادم کێوی

بێستونت بۆ هەڵ دەکۆڵم

دەزگیرانی وەک خۆم بەدبەخت و کلۆڵم

لە دەفتەری

دیوانی دیوانەی شەمی ئەم سەردەمە

هەر چیت بۆ بنوسرێ کەمە

بۆیە تێشووی هەموو تەمەن

بۆ مەلی خۆشخوانی چەمەن
لەبەر تۆ ئەبەستمە کوڵم
دەزگیرانی پەری خەونی شەوان ڕازاوەی سەر قوڵم
دڵ ژان ئەکا
چوون ئارەزووی جارێکی تری ژوان ئەکا.
چاو ئەبینێ، گوێ ئەبیستێ و لووت بۆن ئەکا
هەست و هۆشم
دیسان داوای گێرانەوەی شریتی عومری کۆن ئەکا
ئەوەی لە ناخما نەبزوێ

نانوسرێ بە دەستی کۆڵم
ئەمەوێ بە ووشەی رەنگین
ووشەی وورشەداری سەنگین
رازاوە و پڕ واتای بەتین
یەک دوو دێڕ شیعرت بۆ دانێم
خەم و ترسی،
ژوری سێدارە وەلا نێم
رووی خەیاڵم بکەمە تۆ
بێمە گفتو گۆ خۆ بە خۆ

بڵێم دە سوێندم بۆ بخۆ
کە هێلانەی دڵی کەیلت
بە تەنیا هەر منی تێدام
بۆ نازانی؟!
چەند لە دوای ئەو سوێندە گەرام
بەڵام شەرمی چاوی نەرمت
نەیهێشت تێ بگەم لە هەستی
دەروونی بە کوڵی گەرمت
نەدرکا ئەو رازە لەلام

ئەیهێشت بەو ڕازە زاخاوێ بەو
دڵی کۆیلەم بدەمەوە
هێندەی لە تۆ پاڕامەوە..
ئەت ووت بۆ هەر
گرێ ی شەرمم بکەمەوە
ئەت ووت تا سەر
بەسەر ئەبا شەوگارانی بە خەمەوە
من دێوانەم
تۆ ئەو شەمەی

ئەیهێشت بەو ڕازە ڕاڤاوێ بەو

دڵی کۆیلەم بدەمەوە

هێندەی لە تۆ پاڕامەوە..

ئەت ووت بۆ هەر

گرێ ی شەرمم بکەمەوە

ئەت ووت تا سەر

بەسەر ئەبا شەوگارانی بە خەمەوە

من دێوانەم

تۆ ئەو شەمەی

کە کۆیلەی پەیوەندی باوی ئەم سەردەمەی
من دیلی تۆ
تۆ گیرۆدەی دەستی منی
من سەربەستم
تۆ ژێر دەستەی و شەرمنی
ئەوەندی ئازار ئەچێژی
ئەوەندەی ئەسرین ئەرێژی
ئەوەندەی ئازارت نۆشی
منت بێ بەش کرد لە خۆشی

تۆ لەبەر ئازاری شەرم
من لەبەر ئەوینی گەرم
تۆ لەبەر داب و نەریتی کوردەواری
من لەبەر زیندانی تەنگ و چوار دیواری
خوێن دەچۆڕێ لە جگەرم
من ماڵئاوا لە تۆ و لەخەم
لە تۆ و لە خەم
بەڵام بڕوات هەبێ بڕوا !!!...
ئەوینت بەر نادەم تاهەم

منیش بۆیە لاوانەوەم لەگەڵ تۆیە
ڕاز و نیازم خۆ بە خۆیە
پەیمانیش ناشکێنم تا هەم
تا ئەوینم
ڕۆمانێک دێنێتە بەرهەم

**موسڵ**
**بەشی سێدارە**
**١٩٧٩/٧/١٥**

لەگەڵ خولانەوەی چەرخی زەمانە
بوو بە ئاگر لیم هەرچی هەمانە
ناوێرم نزیک هیچ کامیان کەوم
لێم حەرام بووە خۆراک و خەوم
ساڵان بە تەمای خۆشی ژیان بووم
بەهیوای خۆشی گەل هاورێیان بووم
تەمام بوو کاتێ دەرچم لە زانکۆ
لە کوردستانا بکەم هاتوچۆ
بچمە دیدەنی شار و دێهاتی

شاد بم بە شادی گشت هاووڵاتی
تەمام بوو باوک و برا و خزمانم
ئەرکی هەموویان بخەمە سەر شانم
چاکەی رەنجدەران زۆریان دەمەوە
دەردی هەژاریان لە بیر بەرمەوە
بیان کەم بە خاوەن ماڵ و خۆشحاڵی
نەبینن چی تر رووت و رەجاڵی
ببمە خزمەتکار تا مردن بۆیان
ئەرکێ بەرمە سەر لە جیاتی بۆیان

وام دەهاتە بیر ساڵێ لەساڵان

گوزەرانی ماڵ چاکەم وەک ماڵان

ئەوەی پەنا بێ بۆ منی دەربەدەر

تاکە ماڵەکەی برای بیروباوەر

پێم وایە دەمرم دوا دیدەنیمە

بەجێ دەمێنێ هەرچێ کە نیمە

ڕۆژێک دێ ئاسۆی ڕۆژهەڵاتی سوور

ڕووناکتر دەبێ و نزیک دەبێ دوور

مەلا عەلی

١٩٧٨ کاتی پێشمەرگایەتی

قەرزدارمان بن بەدکار و بەد خو
دایک و باوکتیان لێ کردم دوو روو
دڵیان لە ئاستم رەق بوو وەک ئاسن
شتی وایان ویست کە پەیدا نابن
منیش لەبەر دۆست لە داخی دوژمن
بەڵێنم پێ دان کە پەیدا دەبن
بەڵێنیان پێدام بەڵام لە پاشان
بەقسەی شۆڤار لێم بوون پەشیمان
نەباوکت ژیر بوو نە خانەدان بوو

نە ڕەفتاریشی وەکو ئینسان بوو
بەلام رەوشت و شێوەی جوانی تۆ
کە باس ناکرێ قەت بە گفتوگۆ
ناچاریان کردم پێ لە جەرگم نێم
باوکت بدوێنم کە تۆ بدا پێم
کۆنا شەکرە سێو زوڵف وەک چنوور
گەردن بریوی جوانی لە بلوور
دەم گوڵە باخی نەپشکوتوی سوور
لە کوێ دەتوانم وەسفت کەم لە دوور

تۆ بڵێ ی زوڵفت وەک جاران مابن  
هەروا چین چین و لول راوەستابن  
جوانترین شێوەت باڵاو بەژن بوو  
جێ ی پێ نازینی تۆی شۆڕە ژن بوو  
ئێستاش کە یادم وەکو خۆی مابێ  
بەیادم دوگمەت هەر گرێ دابێ  
لەوساوە رازت لە من بڕاوە  
کەشتی خەیاڵم نقوومی ئاوە  
ئێستاش وا دەستم لە ژیان بەرداوە

هۆشم بە وێنەی کەزیت بڵاوە

گیانە یەکجاری بە جێت دەهێڵم

تا هەتا بەدوای ڕازت دا وێڵم

دەمرم چاوەکەم خەم مەخۆ تۆ خۆش

خەمی لە من زیاد جێ ماوە بۆ تۆش

١٤-١٥/٧/١٩٧٩

شەهید مەلا عەلی/ زیندانی موسڵ/ بەشی سێدارە

لە هاوڕێی زیندانی (غازی فازل حەسەن) وەرگیراوە

حسێن مەولود

خوێندکاری قۆناغی دووی کۆلیژی ئاداب/ زانکۆی سلێمانی

رۆژی (٣)ی نیسان ١٩٧٦ / باخی گشتی سلێمانی

له ڕاستهوه

حسێن مهولود (شههید مهلا عهلی)

ئهحمهد سالح

ئهحمهد مهولود

ئهبوبهکر سدیق ساڵح

خوێندکارانی بەشی ناوخۆیی زانکۆی سلێمانی

١٩٧٦/٣/٧

**ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٧٦/٤/٢٢ زانكۆی سلێمانی**

لە ڕاستەوە

**١- ستار .................. ( كەركوك/ كۆلیژی كارگێڕی)**

**٢- حسێن مەولود ( سورداش / كۆلیژی ئاداب)**

**٣- محەمەد كەریم خەلیفە (سلێمانی / كۆلیژی ئاداب)**

**٤- عوسمان .................. (كۆیە / كۆلیژی ئاداب)**

**٥- ..................................................................**

ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٩١ لە كاتی ڕاپەڕینەكەی شاری سلێمانی لە ئەمنی سلێمانی دۆزراوەتەوە
ئەو نوسینانەی لەسەر وێنەكان هەن لە ئەمنی ئەوسای ڕژێم لەسەری نوسراوە

له ڕاستەوه

**شەهید نهاد خەلیل**

**حسن مەولود**

ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٩١ لە کاتی ڕاپەرینەکەی شاری سلێمانی لە ئەمنی سلێمانی دۆزراوەتەوە
ئەو نوسینانەی لەسەر وێنەکان هەن لە ئەمنی ئەوسای ڕژێم لەسەری نوسراوە

**ساڵی ٢٢/مارتی/ ١٩٧٧**

له ڕاسته‌وه

**شه‌هید نهاد خه‌لیل**

**شه‌هید مه‌لا عه‌لی**

ئه‌م وێنه‌یه له ساڵی ١٩٩١ له کاتی ڕاپه‌رینه‌که‌ی شاری سلێمانی له ئه‌منی سلێمانی دۆزراوه‌ته‌وه
ئه‌و نوسینانه‌ی له‌سه‌ر وێنه‌کان هه‌ن له ئه‌منی ئه‌وسای ڕژێم له‌سه‌ری نوسراوه

لە راستەوە

**شەهید مەلا عەلی**

**شەهید لەتیف**

..............................................

..............................................

شەهید مەلا عەلی
لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەدا

راوەستاوەکان لە راستەوە

١- مامۆستا جەعفەر ٢- پشکۆ ئاگام ٣- سەلاح چاوشین

٤- ....... ٥- .......

ریزی ناوەراست لە راستەوە

١- ئازاد سەگرمە ٢- کاک نەوشیروان ٣- شەهید شێرکۆ جدی

٤- شەهید دڵشاد بەنگینە

ریزی پێشەوەلە راستەوە

١- شەهید حەمە رەزا ٢- شەهید شەماڵی باخ ٣- هاورێ جەبار

٤- گەوگەز ٥- شەهید مەلا عەلی

له چەپەوە ریزی دواوە

شەهید مەلا عەلی

سەلاح چاوشین

هاوڕێ جەبار

ئازادی سەگرمە

له ڕاستەوە

شەهید حەمە ڕەزا قایکەنی

شەهید دڵشاد تۆفیق

شەهید مەلا عەلی

## پەراوێزەکان

١- برای زیندانی: برا دوانەکەی، ئەو کاتە ئەویش لە زینداندا بووە و ئاگادار نەبووە کە ئەم لە ژووری سێدارەیە.

٢- ئاسۆ: برازایەکی بووە بردویانە بۆ چاوپێکەوتنی.

٣- سارا: شاخێکە لە رۆژهەڵاتی دوکان.

٤- برزووت: شاخێکە بەرامبەر ماوە.

٥- زێوێ: گوندێکە لەقەدپاڵی (پیرەمەگرون).

٦- قۆپی: قۆپی قەرەداغە.

٧- تۆڵە: ساڵی ١٩٧٤ رێکخراوێکی کۆمەڵە بەو ناوە لە سورداش بوو، ئەو لێپرسراوی بووە.

٨- ژیلوان: ناوی شاخێکە لەقەزای دوکان و ئەو لیژنەی ئەو ناوچەیەش بووە.

٩- شوێنەکەم: ژوورەکانی زیندان.

١١- پێشڕەوێک: مەبەستی شەهید مامۆستا عەزیز بووە.

١٢- حوزەیران: مەبەستی لەیادی حوزەیرانی خوێناوی ١٩٤٧، ١٩٦٣.

١٣- چاوەڕوانی: ژووری خنکاندن لە موسڵ.

١٤- یادگار: وێنەو بەرهەمەکانی پێش گیران.

١٥- هۆنراوەی نۆهەم: وەسیەتی کردووە لەگەڵ وێنەکەیدا هەڵواسرێ.

١٦- سەیوان گردی سەیوانی شەهیدانە.

١٧- گێڤار و ئەستێر دوو رووەکی کوێستانین.

١٨- هەوارگەکان: لە قەندیل و ناوچەکانی پشدەر و ئالان و سوێسنیانن.

١٩- هۆنراوەی پانزەهەم: وەڵام دانەوەی هۆنراوەیەکە، دوای نوسینی هۆنراوەی ترە.

٢٠- وەسوێنەو، گیبرەو، بادینو، بێ مووش: چوار گوندی ناوچەی پشدەرن.

٢١- لبانە: گوندێکە لە بناری ئاسۆس بەدیوی پشدەردا.

٢٢- هۆنراوەی (١٥،١٤) لە چاپی یەکەم بڵاونەکراوەتەوە و لەدواتردا دۆزراوەتەوە.

سوپاسی تایبەتی ناوەندی ئەرشیفی مەکتەبی سیاسی
یەکێتیی نشتیمانیی کوردستان

بۆ بەڕێزان

١-کاک عەبدولکەریم مەولود.

٢- خێزانی ئەحمەد مەولود (نازەنین حسێن ساڵح، ئاسۆ ئەحمەد مەولود، دیلان ئەحمەد مەولود).

٣- یەکێتی نوسەرانی کورد/ لقی سلێمانی.

٤- کاک عومەر غەریب.

٥- هەموو ئەو بەڕێزانەی هاوکاریان کردوین بۆ سەرلەنوێ کۆکردنەوەو لەچاپدانەوەی ئەم بەرهەمە.

